ناوی کتێب: سەرەتاکانی دەروونناسی و پەروەردەناسی
وەرگێڕانی: حەمەی ئەحمەد رەسوڵ
بابەت: لێکۆڵینەوە
مۆنتاژی کۆمپیوتەری: بەختیار ئەورەحمان
دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی
تیراژ: ٥٠٠ دانە
نرخ: ١٠٠٠ دینار
چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی یەکەم - سلێمانی
www.serdam.org
بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە:
Kteb@serdam.org
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
(١٦٢٠) ساڵی٢٠١١ ی پێ دراوە

## وتەیەک بۆ دەستپێک

هەمیشـــە گەڕانەوە بۆ مێژووی سەرهەڵدان و دەرکەوتنـــی زانین و مەعریفە، کارێکی پێویســـت بووەو زۆر ئاسانیش نییە. بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا کـــە زۆرینەی خەڵک لـــە پرۆســـەی خوێندنەوەو خۆڕۆشنبیرکردن دوورکەوتوونەتەوە، ئەم سەردەمە خەسڵەتەکانیشـــی لەگـــەڵ خۆیـــدا هەڵگرتووە، ســـەردەمی تەکنۆلۆژیـــاو تەکنۆترۆنییەکانـــە، کۆمپیوتـــەرو ئینتەرنێت لە برەودان و هەوادارانی لە تەشـــەنەکردندان، سەتەلایت و مۆبایل و ئۆتۆمبیلی دوا مۆدێـــل کـــە خاوەنی ئەقڵـــی ئەلکترۆنییەو لە شۆفێرەکەی خۆی زیرەکترە، وای لە مرۆڤی هاوچەرخ کـــردووە وەکو کۆیلە، ملکەچـــی هەموو داخوازی و تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆی و دەوروبەرەکەی بێت، بەوەی کە ببێتە خاوەنی ئامێرو کەرەستەکان.

ئـــەو کارەش وا دەکات مرۆڤی ئەم چرکەســـاتە فریای خوێندنەوەی ژیان و گوزەران و کۆمەڵگەکەی نەکەوێـــت، تەرخانکردنـــی کات بـــۆ ئـــەو هەموو

داخوازییانە گرنگترین کردارێکی لێ زەوت ئەکاتەوە کــە بریتییە لە خۆڕۆشــنبیرکردن و بەرزکردنەوەی ئاســتی فەرهەنگی و مەعریفیی خودی خۆی، وەکو تاکێکی مەدەنیی شارنشین.

لەبەر ئەوە لــەو پێودانگەوە بەندە وای بە باش دەزانم کە هەر هیچ نەبێت ســەرنجی تاکی کوردی بۆ خوێندنەوەی پرۆژەی کتێبی گیرفان ڕابکێشرێت و ناوبەناو زانســتە گرنگەکان و فەلسەفەو چەمکە مەعریفییــە جیهانییەکانــی پێ ئاشــنا بکرێتەوە، بەتایبەتی لەو ڕووەوە کە قەبارەی کتێبەکانی گیرفان بچووکن و کاتی زۆر نابەن و سەرقاڵبوونی ئەم مرۆڤە بێ کات و جەنجاڵە ئاڵۆزتــر ناکات. بەڵام ئەوەش جێی دوودڵی و گومان نییە کە زانیاری سەبارەت بە زانســتێکی گرنگی وەکو دەروونناسی یان پەروەردە زۆر پێویســت و بایەخدارە بۆ مرۆڤــی هاوچەرخ، چونکە لە لایەکەوە دەروونی هەموومان سیخناخە لە خەم و پەژارەو دڵەڕاوکێ و ترس لە ئەمڕۆو سبەینێی خۆمان و منداڵ و ئایندەی کۆمەڵگەکەمان..

لەلایەکــی دیکــەوە دەبێ ئــەوەش بزانین کە پەروەردەو فەلسەفەی پەروەردە گرنگی و بایەخی بۆ ئێمە وەکو مرۆڤ و بۆ خێزان و کۆمەڵگەکەمان لــە چیدایە؟! بۆ ئەوەی بزانین چۆن دەژین و چۆن ژیانی ئاســوودەو بەختەوەر بۆ خۆمان و خێزان و منداڵانمان دابین دەکەین؟

پێم خۆشە ئەم وتەیەی بەندە وەکو بەرایی ئەم کتێبە خنجیلانەیە، ئاکامی ڕازاوەو قەشەنگی هەبێت و خوێنەر هانبدات کە لەلای خۆیەوە دەستپێشخەر بێـــت تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیەمان ڕۆشـــنبیر بن و چەمکە مەعریفی و فەلســـەفی و زانســـتییەکان یەکالآبکەنەوەو شـــرۆڤەیان بکەن..

خوێندنەوەی کتێبە زانستی و مەعریفییەکان بۆ تاکی کورد زۆر گرنگن، چونکە دەتوانێت شوناس و پێگەی خۆی بناســـێتەوەو نەخشە بۆ ئایندەی خۆی و کۆمەڵگەکەی بکێشێت، بە پێچەوانەشەوە تاکـــی نەزان و نەخوێندەوار نە لە شـــوناس و نە لە ژیان و نە لـــە کۆمەڵگەکەی خۆی تێدەگات و نە دەشتوانێت نەخشە بۆ خۆی و ئایندەی ئەوانی تر بکێشێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم وتانەدایە، بەندە داخوازبووم ئەم دوو بەشە لە دوو کتێبی جیاوازەوە بۆ سەر زمانی کوردی وەربگێـــڕم، یەکەمیان باس لە چۆنییەتیی ســـەرهەڵدانی دەروونناسی دەکات، دووەمیان باس لە پەیوەندیی نێوان فەلسەفەو پەروەردە دەکات و ســـەرەتاکانی پەروەردە شیدەکاتەوە، بۆیە بەباشم زانی تایتڵی ئەم نامیلکە بچووکە یەک ناونیشـــان بێت و سەرهەڵدانی هەردوو زانستەکە بێت.

هەمووشـــمان دەزانین کە بابەتی سەرهەڵدانی

سەرەتاکان و پرەنسیپی دوو زانستی وەکو دەروونناسی و پەروەردە یان هەر زانستێکی دیکە، چەند گرنگن و لە جیهاندا بایەخی ئەوتۆیان هەیە.

خۆزگە لای ئێمەش زانستێک و زانایەک یان قوتابخانەی فەلسەفی و ڕێبازێکی فەلسەفی سەریان هەڵدەدا. خۆزگە گەنجانی کوردستان خوێندنەوەیان دەکردە کولتوورو فەرهەنگی خۆیان و زەمینەیان خۆشدەکرد بۆ وەدەرکەوتنی زانست و فەلسەفەی کوردی.

هیوادارم ئەم دوو وتارە بایەخی خۆیان بە نەوەی نوێمان بگەیەنن، ئەگەرچی فێربوونی یەک وشە یان چەمکیش بێت، هیوادارم کاری وەرگێڕانەکەش باش و بەسوود بێت و سەری خوێنەر جەنجاڵ نەکات بە بێهودەیی و بە پێچەوانەوە داخوازم ئاسوودەیی و کاتی خۆشنوودیی بۆ مەیسەر بکات.

وەرگێڕ

١٩ی٩ی٢٠١٠

## دەروونناسی (سایکۆلۆژیا) چۆن دەرکەوت؟

**نووسینی: د. و. ئی. سارجێنت**

لەوێـــوە دەســـت پێناکەین کە بپرســـین ئایا دەروونناســـی چییـــە؟ بەڵکو لەگەڵ دەســـپێکدا تەماشـــای مێژووی ئەم بابەتـــە دەکەین، ئەویش لەبەر دوو هۆ:

یەکـــەم: وا باشـــترە وەڵامـــی ئەو پرســـیارە بدەینەوە: سایکۆلۆژیا چییە؟

ئەوەش لـــە پای ئەوە دەیبینین و دەیزانین کە کارێکی مەزن لەلایەن سوپایەک لە بیرمەندانەوە لە گۆڕەپانی دەروونناسیدا دەستەبەربووە.

دووەم: خەڵکانێکی زۆر بڕوایان وابوو، تەنانەت هەندێکیان تا ئێستاش وای دەبینن کە دەروونناسی هاوچەرخە و پەیوەستە بە ڕێنوومایی و ئامۆژگاریی پەنهانەوە کە ڕووناکبیری جیدی تەنیا یەک دەقیقە لە کاتەکانی بۆ تێگەیشتن لێی بەهەدەرنادات.

ئێمـــەش ئەوە دەزانین کە هـــۆکاری دووەمیان

بناغەی ئەوجۆرە هەڵوێستەیە، کە زۆرینە دەیگرنەبەر لە هەر بارێکی نوێدا. هەر بۆ نموونەش کاتێک زانا لیستەر Lister شێوازەکانی پاکژکردنەوەی برینی لە نەشـــتەرگەریدا هێنایە کایەوە، بە گاڵتەجاڕیی توومند وەڵامدرایەوە، تەنانەت لەلایەن هاوپیشەکانی خۆشییەوە.

بەڵام ئـــەوەی ئـــەم زانایە پێشکەشـــی کرد، ئەمڕۆ جێی ڕەزامەندییـــە لەلایەن هەموو ئەوانەوە کە لەگەڵ برینـــداری و بڕیندا مامەڵە دەکەن، هەر ئامۆژگارییەکانی ئەویشـــە کە لـــەم ڕۆژگارەدا بۆ شـــێوازەکانی پاکژی و خاوێنکردنەوە لە پرۆسەی نەشتەرگەریدا پەرەیان سەندووە.

هەرچۆنێک بێت، سایکۆلۆژیا زانستێکە پسپۆڕو مامۆســـتایان بەســـەر جەمـــاوەردا ســـەپاندیان، نهێنییەکـــەش ئەوەیـــە چارەســـەری بابەتـــی سەرنجڕاکێشـــەریان کردووە و ڕەفتارە ناڕاســـت و ناساغەکانی خەڵکیشیان وروژاندووە.

ئەم زانســـتە وەک لقێک لە لقەکانی فەلسەفەی پێش لەدایکبوونی مەســـیح بە ماوەیەک ســـەری هەڵـــداوە، یەکێـــک لـــە قوتابی و شـــاگردەکانی ئـــەم زانســـتەش بیرمەندی مەزن ئەرســـتۆ بووە، دەشـــتوانرێت لە ڕێـــی نووســـینەوە گرنگیدان بە زانســـتی دەروونناســـی بگەڕێنینـــەوە پێش ئەو

ســـەروەختە، بەڵام ئەرســـتۆی مامۆستای یەکەم، یەکەم کەسێکە کە کۆششی کردووە تا بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لە شـــێوازی بیرکردنەوە و بڕوای خەڵک تێبـــگات، ئامۆژگارییەکانی ئـــەو لە یەکەم ڕۆژەوە جێی بایەخپێدان بوون، ئەرســـتۆ بایەخی داوە بە کێشـــەکانی هەستەوەری مرۆڤ، واتە چۆن هەست دەکەین، دەبیســـتین، چێژوەردەگریـــن، دەبینین، هەروەها گرنگیی داوە بە کێشەکانی خەیاڵکردنەوە، بیرهاتنـــەوە، بیرکردنـــەوە و بەڵگـــە هێنانـــەوە، ئەرســـتۆ زانیاریی لەبەردەســـتدا نەبووە سەبارەت بە کۆئەندامی دەمار، ئـــەو زانیارییە گرنگانەی بۆ سایکۆلۆژیای هاوچەرخی ئەمڕۆ ڕەبایەخن.

لـــەو سەردەمەشـــدا بە شـــێوەیەکی گشـــتی تێڕوانینی نۆژداریی بـــاوی ئەوکاتە قبوڵکراوە، کە بریتـــی بووە لـــەوەی ژیان بەوەوە پەیوەســـتە لە شادەمارەکانی خوێندا هەوا هەبێت و ئەم هەوایەش پرۆســـەی هەناسەدان مەیســـەر دەکات کە بووەتە بناغە بۆ ژیان، دەمارەکانیش هەســـتەکان ئاڕاستە دەکـــەن، بەڵگەش بۆ ئەوە، هەبوونی شـــتێکە لە ناخماندا، کە بیر لە دۆزەکانی ژیان دەکاتەوە.

پاش ئەرستۆ دەستەیەک لە ڕووناکبیران هاتنە گۆڕێ، کە بە کۆمەڵەی فەیلەســـوفە ڕەواقییەکان ناسراون، لە ئەرستۆ دوورتر ڕۆیشتن و ڕایانگەیاند:

توانســـتەکانی بیرکردنـــەوە تا پلەیەک لە گشـــت بوونەوەرانـــدا خۆرِســـکە، هەروەهـــا برِوایـــان بە حیکمەتێک لە گیانلەبەراندا هەیە، کە ئەندێشـــەیی نییە، ئەو حیکمەتەش لە سروشـــتدا خەسڵەتێکی بۆماوەییە، بەڵام تەنیا مرۆڤ توانای بیرکردنەوەی هەیـــە و دەتوانێـــت بـــاش و خـــراپ لـــە یەکدی جیابکاتەوە.

لـــە ســـەردەمی هیلینیـــدا، ئەو دەمـــەی کە گریکییەکان و عیبرییەکان هەریەکەیان کاریگەریی هەبوو بۆ ســـەر کولتووری ئـــەوی دیکە، لەلایەن بزووتنـــەوە ئاینییـــە جیاوازەکانـــەوە بایەخدانێک تێبینی دەکرا، ئەم بایەخەش بەرەو ئەوە چوو کە سنوورێکی جیاکەرەوەی لەنێوان توخمە سروشتی و لـــە سروشـــتی بەدەرەکانی سروشـــتی مرۆڤی خولْقاند. دیارە قەشـــە "پۆڵس" (پۆڵسی پیرۆز) لەوکاتەدا بەو رِێنومایی و بۆچوونانە سەرسامبووە کە وتوویانە: خەســـڵەتەکانی جەستە جیاوازن لە خەسڵەتەکانی رِۆح و گیان.

بەڵام لە ســـەدەی ســـێی زاینییـــدا، بیرمەند ئەفلۆتیـــن Plotinus لە رِێـــی لێکۆڵینەوە لە چالاکییەکانی جەســـتە، ئەو شێواز و رِێگەیەی لەو لێکۆڵینەوەیەدا بەکاریهێنا، کە لەم چرکەســـاتەدا میتـــۆدی تێرِامان لە خـــود یـــان لێوردبوونەوەی

ناوەکی ناسراوە IntrospectiveMethod، ئەم میتۆدەش بەواتای گەشتێکی کورت بەناو ژیری و ئاوەزەماندا بۆ ئەوەی ئاشـــکرای بکەین کە چۆن بیردەکەینەوە و خەیاڵ دەکەینەوە و..هتد.

بەڵام ئۆگەستین Augustine زانای لاهوتی و ئەدیبی مەزن، کە لە ساڵی ٤٣٠ی زایینییدا کۆچی کردووە، ئاســـەواری ئەم لێکۆڵینەوەیەی گرتەبەر، لـــە دووتوێـــی ئامۆژگارییەکانەوە ئـــەم تەرزە لە بیرکردنەوەی تێڕامانی جێگەیەکی شـــیاو و بڵندی هەیە لە دەروونناسیدا.

بەشـــێوەیەکی تایبەتـــی، ئـــەوەی شـــایانی گرنگییە لە پەرەســـەندنی فەلســـەفەی دێریندا لە چەرخی ئەرســـتۆوە تا ئۆگەستین، هەوڵدانێکە بۆ دابڕینی پرۆســـەی ژیری لە پرۆســـەی جەستەیی، ئەمـــەش بەتـــەواوی بـــڕوای پێ هێنـــراوە، وەک چـــۆن دواتر دەیبینین، چونکـــە کارلێکی کاریگەر لەنێوان ئەقڵ و جەســـتەدا هەیە، بەڵام تێدەگەین کە چۆن دەروونناســـی لە قۆناغە بەراییەکانیدا لە پەرەسەندنیدا پاش سەدەی دوازدە بەدوو ئاڕاستەدا پێشـــکەوت، چونکە هەوڵ و کۆششـــەکانی نێوان سەدەی پێنجەم و دوازدە زۆر کەم بوون: یەکەمین ئاڕاستە: بایەخدان بە پێکهاتە و کاری کۆئەندامی

دەمـــار، دووەمینیش: بایەخدان بـــە هەمەجۆریی ڕەفتاری مرۆڤ بە شێوەی تاک و کۆ.

لە لێکۆڵینەوەشماندا بۆ دەروونناسی دەتوانین ئەوە دەربخەین کە:

ا. ڕووناکبیر و نووســـەرە گەورەکان تێکۆشان بۆ تێگەیشـــتن لەچۆنیەتیی لێکدانەوەی ڕەفتاری مرۆڤ بە گشتی و هەڵســـوکەوتەکانی بە شێوەی نەخۆشی.

ب. لـــە چاخـــی ڕێنیســـاندا زانســـتێکی نوێ لەدایکبوو ســـەبارەت بە مرۆڤ، کە ســـەرنجی لە ئەرکە سروشتییەکانی دەدا وەک کرداری جودا لەو چالاکییانەی کە گیانێکی لەڕادەبەدەری سروشتیی هەیە.

بیرمەنـــدی نـــاوداری فەڕەنســـی دیـــکارت Descarte بـــە ڕوونی شـــێوازی میکانیکی لە لێکدانەوەی هزرو ڕەفتاری مرۆڤدا شـــرۆڤەکردووە، ئەوەش کاتێک گەیشـــتە زانینـــی گرنگیی لەش لە شـــێوەی تایبەت لـــە ڕەفتاردا، بـــڕوای بەوە هێنا کە توانســـتی مرۆڤ لە بیرکردنـــەوەدا دەکەوێتە دەرەوەی مێشـــکەوە، بەڵکـــو ئـــەو توانایەی لای خوداوە بۆ دێت.

بێگومان ئەمەش ئەوە دەردەخات کە توانستی بیرکردنەوە خۆڕسکە، بەوجۆرەش پشت بە ئەزموون

و کارایی جەستە نابەستێت، تەنانەت ئەوەی کە پەیوەستە بە هەستی ویژدانییەوە، هەستێک لە ئارادان کە پەیوەستن بە جەستەوە، هەستێکیش هەن کە پەیوەستن بە گیان یان ئاوەزەوە.

یەکەمین بیرمەندێک کە بەرهەڵستی و دژایەتیی دیکارتی کردەوە، بیرمەند جۆن لۆک John Locke بوو. کە ئاشکرای کرد (لە وتارێکیدا بەناوی تێگەیشتنی ئادەمیزادی ساڵی ١٧٦٠) گشت زانیارییەکانمان بەرهەمی کارایی و رامانەکانمانن کە بەبێ ئەوان هزرەکان بوونیان نییە، شارەزایی و کارامەییشمان لە یەکێتیی هەستەوەرییە جەستەییەکانمانەوە سەرچاوەیان گرتووە لە دووتوێی ئەندامەکانی چاو و گوێ و ئەوانی دیکەوە...

بە بڕوای زانا جۆن لۆک هزرەکانمان لە دەرئەنجامی پوختەی تووخمگەلێکی دیاریکراوەوەیە بۆ هەموو کارایی و شارەزاییە جوداکانمان کە لە یەکێتیی یەکەیەکی تەواودا یەکیان گرتووە، بۆ وێنە بیرۆکەی داد لە دەرئەنجامی چەند کارامەیی و شارەزاییەکەوە دەستەبەر بووە، کە کردارە دادوەرییەکان دەگرێتەخۆ، ئەم تووخمە گشتییانەش کورتکراوەی هەمان شارەزایی و کارزانین کە لە یەکەیەکی تەواودا یەکیان گرتووە

و بە بیرۆکە نــــاوزەد دەکرێت. جیاوازیی گەورەش لەنێوان هەڵوێستی جۆن لۆک و دیکارتدا لەوەدایە کە لــــۆک بڕوای وابوو پەیوەندی لـــە نێوان هزر و هەستەکانماندا لەئارادا نییە.

کاتێک بە ئاوەز بیردەکەینەوە، بەشێوازی هزر یان وێنەی زەینی بێت، پێویســـتە زانای ئەڵمانی هێربـــەرت ١٨٤١-١٧٧٦ (Herbert) بـــە هێند وەربگرین، بەخششـــەکانی لە بواری دەروونناسیدا کاریگەریی گرنگی هەیە لەسەر تیۆری پەروەردەیی، ئـــەو وای دەبینی کە ئاوەز کۆمەڵێـــک هزرە یان بارســـتاییەکە لە پەیوەســـتبوونی هەســـتی، کە تێدەکۆشـــێت بـــۆ داگیرکردنی شـــوێنی شـــیاوی خۆی. هزر و وێنە زەینییەکان ســـێ جۆرن: هزری لەیەکچوو، هزری ناکۆک و هزری جوودا.

هزری لەیەکچوو، لە کاتی جیاوازدا لەیەکدەچن، نموونەی ئەوەش خوێندنی باڵندەیە لە سبەیناندا، ئەمەش یەک بیرۆکە یان وێنەی زەینییە، خوێندنی باڵندەکەش لە ئێوارەدا هەمان شتە، کە وێنەیەکی زەینیی وێکچووە.

هزری ناکۆکیـــش، ناکۆک نین بـــە مانای دژ، بەڵکو لـــە جۆردا جیـــاوازن، بۆ وێنـــە خوێندنی باڵنـــدە و دەنگی گڕی پیاوێک جـــوودان. وێنەی زەینـــی جووداش، ئەو وێنانـــەن کە وێنەیان نییە.

بۆ نموونە: وێنـــەی زەینیی خوێندنـــی باڵندە لە وێنەی پارچە کولێرەیەک جوودایە. ئێســـتاش ئەو وێنە زەینییە جیاوازانە ئامادەن ڕێگە بەرەو مێشک بگرنەبـــەر، ئەگەر دوو وێنەی زەینی لە یەک کاتدا ئامادەبوون، لە یەک وێنەی زەینییدا دەتوێنەوە، بە مەرجی لێکچوونیان.

نموونەی ئەوەش یەکێتیی زنجیرەیەک لە نۆتەی موزیکییە لە یەک ئـــاوازدا، بەڵام کاتێک ئەم وێنە زەینییـــە جیاوازە لە کردارێکی درێژخایەنی ئاڵۆزدا یەکبگرن، بۆ وێنە سینەما، وێنەی جوڵاو دەبینین و گوێمان لە ژاوەژاوی دەنگە جووداکان دەبێت، لە دووتوێی کردارە ئاڵۆزەکانەوە وێنەی سینەماییەکی قسەکەرمان بۆ دەخەملێنێت، بەڵام ئەگەر تواندنەوە و ئاڵۆزی ئەستەم بوون، ئەوا لەنێوان وێنە زەینییە ناکۆکەکاندا کێبڕکێ دەردەکەوێت، ئەو کاتەش یان گوێ بۆ خوێندنی باڵندە یان دەنگی گڕی پیاوەکە دەگرم، لێرەشـــدا ئەو بیرۆکەیەیـــان کە بەهێزترە کێشـــەی یەکەم یەکلایی دەکاتـــەوە، ئەگەر مکوڕ نەبم لەسەریان یان هەڵاودێری نێوانیان نەکەم.

هەر کاتێک هـــزرەکان یان وێنـــە زەینییەکان ئاوەزیـــان بڕی هەرگیز ون نابـــن، ئەگەر هزرەکان بەرەو مەڵبەندی ئاوەز جوڵان، ئەوا تیشـــکۆییانە دەبێـــت و بە ئاشـــکرایی دەردەکەوێت، ئەگەر ئەو

کردارەشـــی ئەنجـــام نـــەدا، ئەوا یـــان دەبێت لە دەرەوەی ئاوەزدا و لە لێواری هەســـتدا جێگەیەک بۆ خۆی بدۆزێتەوە، لە پەراوێزێکی پێوانەییدا یان بەلای جیهانی نەستدا تێپەڕببێت.

هێربێرت-ی زانا پێشنیاری زۆری ئەوانەی کرد، کە زانا و دەروونناس فرۆید Freud سەلماندنی، زانایانی دوای ئەویش بەهەمان شـــێوە سەلماندیان و ڕاستیی ئەوە پاشتر دەبینین. سەربارى ئەوەش هێربێت کۆششی زۆری بۆ ئەوە کرد کە زەمینە بۆ دەروونناســـی خۆش بکات، کە لە پەروەردە نزیک ببێتەوە.

دەبێت ســـەرنجی ئـــەوەت دابێت کە پێشـــتر دەربارەی کۆمەڵە هزری نێو ئاوەز قسەم کرد کاتێک بیرۆکەیەک ڕاگـــوزەر دەکات، وەردەگیرێت ئەگەر جێگای شـــیاوی لەنێو ئەو کۆمەڵەیەدا دۆزییەوە، واتە لەنێو بارستایی درکپێکراوی ناوەکی-هەستیدا، با ئەوەش ڕوون بکەمەوە بەمشێوەیەی خوارەوە:

دەتوانیت بەشـــێوازێکی خێراتر لـــە کتێبێکی سایکۆلۆژیا تێبگەیت ئەگەر بیرۆکەیەکت سەبارەت بە بابەتی دەروونناســـی هەبێت، بەواتای ئەگەر لە ئاوەزتدا کۆمەڵێک هـــزر هەن، کە پەیوەندییان بە سایکۆلۆژیاوە هەیە، ئێســـتاش ئامانجی پرۆسەی پـــەروەردە چاندنی هزرەکانە لـــە ئەقڵی منداڵدا،

هێربێـــرت پێـــی وابوو ئەوپـــەڕی داناییـــە ئەگەر مامۆســـتا توانیی بە هزرەکانـــی نێو ئەقڵی منداڵ ئاشـــنا بێت، هەر لەبەر ڕۆشـــنایی ئەوەی هێربێت پێشکەشـــی کرد ئەو هزرە نوێیانەیە کە بەشێوازی گونجاو و ماقووڵ دێنەدەرەوە لەو کۆمەڵە هزرانەی لەنێو ئاوەزدا هەن.

نموونـــەی ئەوەش، کاتێک مامۆســـتا وانەیەک سەبارەت بە دابونەریتی باڵندە بە خوێندکارەکانی دەڵێتـــەوە، کە منداڵان وا ڕاهاتوون بیبینن و بزانن دەربارەیان، پاشـــان ئـــەو زانیارییـــە نوێیانە بەو کۆمەڵە هزرە تایبەتانەوە دەبەستنەوە.

پاش ئەوەی بۆچوونـــی هێربێرتمان تێپەڕاند، بـــەوەی کـــە ئەقڵ کۆمەڵێـــک هزرن، گشـــتییان لـــە پێناوی هەژموونداا تێدەکۆشـــن، بـــا ڕامانێک لـــەو پەرەســـەندنە گرنگـــەی دیکـــەدا بکەین لە دەروونناســـیدا، کـــە بەزانســـتی فراســـە الدماخ فرینۆلۆژی Phrenology ناودەبرێت.

ڕەنگە زانیاریی ســـاکارت لەبارەی ئەم زانســـتەوە هەبێـــت، زۆرجار نەخشـــەی ڕوونکردنەوەی ســـەری ئادەمیزادێک دەبینی کە ئاماژە بەبەشەکانی مێشکی دەکات بەنـــاوی ناوچەی یاد و ناوچـــەی بیرەوەری و ناوچەی قســـە، ئەم نەخشـــەیە لە گۆڕەپانی تایبەت بەنمایشە کلاسیکییەکان لە دەرەوەی چادری ئەو پیاوە

هەڵواسراوە کە بەپیاوی فراسە یان چاکبین ناسراوە.

ئــەم پیـــاوە ڕایدەگەیەنێت کە لـــە تواناییدایە ئەو زانیارییەت پێببەخشــێت کــە توانای ئەقڵی جۆراوجۆرت هەیە، زانیاریت دەربارەی کەســێتیی خۆت پێشکەشدەکات، تەنیا بە دەستلێدانی شوێنە دەرپەڕیوەکانی ســـەرت، بەڵام ئەگەر ئەم تیۆرەو شــێوازەکەی ڕاســت بوونایە، ئەوا دەروونناسان دەیانتوانی هەزاران سەعات سوودمەند بن و بەفیڕۆ نـــەدەن لە هەوڵیاندا بۆ مەزەندەکردنی توانســـتی تاک و کەســـێتییەکەی، بەڵام بەداخەوە ئەم بلّقە وەهمـــی و فرینۆلۆژییانە بەخێرایی تەقین و لەگەڵ بادا ڕۆشتین.

فرانز جۆزێــف گال Franz Josef Gall ١٧٥٨-١٨٢٨ ئەو زانایە بوو کە تیۆری فراســـەی مێشـــکی داهێنا، کە هەر لـــە منداڵییەوە گرنگ و بایەخی نائاســـایی بەپەیوەندیی نێـــوان قەبارە و شــێوەی کەللەســـەری هاوڕێکانی و توانای ئەقڵی و خەسڵەتی کەسێتییان دەدا، ئەو وەک گەنجێکی کۆششـــکار خوێندنەکەی لە بـــواری توێکارزانیدا یارمەتیدەری بوو لە پەرەسەندنی ئەم بایەخپێدانە.

پاش ئەوەی لەڕێی نەخۆشخانەکانەوە زانیاری زۆری کۆکـــردەوە، تیـــۆری نـــاوداری فرینۆلۆژی Phrenology داهێنـــاو لـــە ئەورووپـــادا کۆڕ

و ســـیمیناری لەبـــارەوە ســـازدا و ســـەرکەوتنی بەدەستهێناو بایەخی میللی لە ئەمەریکا و بەریتانیا وروژاند. بەڵام توێژینەوەکان لەسەر مێشک ئەوەی سەلماند کە ئەم تیۆرە لە بناغەوە درۆیە.

هەرچۆنێک بێت، گال Gall نووشووستی هێنا لەو هەوڵەیدا کە دەیویست جوگرافیای سەر بکاتە تەرازوو یان پێوەرێک بۆ توانســـتی ئەقڵی، بەڵام ســـەرکەوتنی بەدەســـتهێنا لەو بوارەدا کە دڵنیای کردینەوە پەیوەســـتیی توندوتۆڵ لەنێوان ئەقڵ و مێشکدا هەیە، لە دەرکەوتنی ئەگەری چڕبوونەوەی هەڵچوونە دیاریکراوەکان لەمەشدا گال شایانی ڕێز لێنانی گەورەتر بوو لەوەی چنگی کەوت.

لێکۆڵینـــەوە ســـەبارەت بـــە ســـایکۆلۆژیای هـــزر و بەهرە ژێرییـــەکان مەحاڵـــە، ڕۆژێک دێت پێویستیی بە تێگەیشـــتنێکی ڕاستیی کۆئەندامی دەمارییە، لەوانەش مێشـــکی مرۆڤ، ئەگەر ئەقڵ لە کۆمەڵێک هـــزر پێکهاتبێت، کە لە ڕێی ئەندامە هەســـتەوەرییەکانەوە بیگەنێت، داخۆ دەبێت چی بقەومێت لەنێوان شتی بینراو و کارامەیی کردارەکی بۆ بینینی، بیرۆکەی ئەو شتەش چییە؟ ئەی چۆن درک بەو شتە و شتەکانی دیکە دەکەین؟

مەزەنـــدە کردنی جـــۆن لۆک تەواو دروســـت بـــوو کاتێـــک ویســـتی بیســـەلمێنێت کە گشـــت

زانیارییەکانمـــان لە دەرئەنجامی شـــارەزایی پێش وەختە و تێڕامانەکانمانەوە خەمڵیون کە بێ ئەوەش هزرەکان بوونیان نییە، شـــارەزایی و کارامەیشمان بریتییە لە یەکێتی هەستە جەستەییەکانمان لە ڕێی ئەندامە هەســـتەوەرییەکانەوە: وەک چاو و لووت و گوێ...

هەوڵە فیزیۆلۆژییە جدییەکان بۆ بەرپەرچدانەوەی پرســـیاری ســـەبارەت بە چۆنییەتیـــی وەرگرتنی هەســـتەکان لە هەموو ڕاو هەستە کارتێکراوەکاندا، تەنیا لە سەرەتای نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا دەستی پێکرد.

زانای ســـکۆتلەندی چارلـــس بێل Charles Bell دوو جـــۆر دەمـــاری دۆزییـــەوە، ئەوانیش: دەماری هەستەوەری و دەماری بزوێنەری.

دەماری هەســـتەوەری، وریاکەرەوەی هەســـتی دەگوێزنـــەوە بۆ مێشـــک، دەمـــاری بزوێنەریش، وەڵامدانەوە دەگوێزێتەوە بۆ بەشـــە گونجاوەکانی لەش.

ئەم دۆزینەویە هێند پڕ بایەخ و بەهادار بوو بۆ ئەو زانایانەی لە لێکۆڵینەوەی کاری جۆراو جۆری مێشـــکدا گەشـــتبوونە قۆناغی کۆتایی. یەکەمین زانایەک لە کایەی فســـیۆلۆژیدا زانای سکۆتلەندی پێیـــر فلۆرانـــس Pierre Flourens بوو کە

تاقیکردنەوەکانی لەسەر مێشکی کۆتر بەئەنجام دا.

ئەم کارەشی جیاواز بوو لە کاری فرینۆلۆژییەکان، چونکە کارەکەی مۆرکی پرســـی زانستی جێگیری پێوە دیار بوو، ئەوەی ســـەلماند کە مێشـــک وەک گشت کاردەکات، کاتێک هەر بەشێکی ئامادەباشی تێدا دەبێت، نەک بە بەشی جوودا وەکو چۆن گاڵ و قوتابییەکانی بڕوایان وابوو.

بوونیاد و سروشـــتی پێکهاتەی مێشـــک بوونە بابەتی زانســـتی گرنگ، بەخێرایی ئەوە دۆزرایەوە کەوا مێشـــک لـــە دوو ماددەی جیـــاواز پێکدێت: ماددەیەکی سپی و ماددەیەکی خۆڵەمێشی.

مـــاددە خۆڵەمێشـــییەکە لـــە ژووری دەماری پێکهاتووە و ماددە سپییەکەش لە ڕیشاڵی دەماریی گوێزەرەوە پێکهاتووە.

زانای ســـکۆتلەندی مارشاڵ هۆڵ Marshal Hall ئـــەوەی بۆ دەرکەوت کـــە ڕەنگە جووڵەی جەســـتەیی دیاریکراو هەبێت بەبێ یارمەتی مێشک ڕووبـــدات، تاقیکردنەوەکانـــی لەســـەر هەندێـــک گیاندار ئەنجـــام دا، کە ســـەربڕدرابوون، ئاکام و دەرئەنجامەکان ئەوەیان ئاشـــکرا کرد کە هەندێک جووڵەی جەســـتەیی لە دەرەوەی چێوەی هەست یان کۆنترۆڵی ویستدان.

ئەزمـــوون و تاقیکردنـــەوەی زۆر لەســـەر

کۆئەندامـــی دەماریی و دۆزینـــەوەکان، بایەخدانی بـــە ئەندامەکانی هەســـتەوەرییەوە قوڵترکردەوە، نـــاوداران و ناوگەلێکـــی زۆر ناســـراو هـــەن کـــە خوێندکاری تێکۆشـــەر لە دەروونناســـیدا باشیان دەناسن و لەوانەش زانا: هێلمۆلتز Helmoltz و هێرینـــگ Hering و وێبەر Weber و فیخنەر Fechner، کە تیۆرییان ســـەبارەت بەبینین و زانا هلمولتز دەربارەی بیستن کاری کردووە.

بـــەڵام زانایان وێبەر و فیخنـــەر کارو خزمەتی مەزنیان لەکایەی دەســـتلێدان و توانستی جیاوازی لەنێوان کێشـــە جیاوازەکاندا پێشکەش کرد. هەر لە ڕۆژگاری ئەواندا هەردوو هەستەوەریی بۆنکردن و چێژوەرگرتـــن خوێندراو لێکۆڵینەوەیان لەســـەر کـــرا، ویبەڕی زانا لەم کایەیەدا خزمەتی بەرچاوی پێشکەش کرد.

دەرئەنجامـــی ئـــەو ئەزمـــوون و تاقیکردنەوە فسیۆلۆژییانە و دۆزینەوەکان هەنگاوی گەورە بوون بـــەرە و بڕوابوون بەوەی بیر و هەســـتی ویژدانی و ویســـت و ئارەزوومان و دەکرێت شـــرۆڤە بکرێن پێکەوە بە زمانی کۆئەندامی دەمار.

بەڵام پشـــکنینەکان بە وردی ئەوەیان ئاشکرا کرد، کە تێگەیشتنی مەتریاڵی لە پرۆسە ژیرییەکان ناکرێت بەرجەســـتە بکرێن و بپارێزرێن، هەرچەندە

کەس ناتوانێت نکۆڵی لە گرنگیی ڕۆڵی کۆئەندامی دەمار لە کرداری ئەقڵی و هەڵسوکەوتماندا وەک گشت بکات، تا چاخی چارلس داروین Charles Darwin بایەخدان بە دەروونناسی چڕبووبووەوە لە چۆنیەتیی دەستکەوتنی زانیاری لەلایەن مرۆڤەوە لە جیهانی دەوروبەری خۆیەوە و چۆن وەک ئاکامی شارەزاییەکەی کارلێکی لەگەڵدا دەکات.

بەڵام یەکێک لە هەرە دیارترین کارەکانی لە سەردەمی داروین-دا پێشکەش کرا، فاکتەرێکی نوێ بوو لە لێکۆڵینەوەی دەروونناسیدا کە ئەویش بیرۆکەی پەرەسەندن بوو: هەموو شێوەکانی بوونەوەرە زیندووە باڵاکان لە شێوە نزمەکان پەرەیانسەند، هەروەها پێویست بوو تێبینیی لایەنە هاوبەشەکانی ڕەفتاری مرۆڤ و ڕەفتاری گیانلەبەران بکرێت.

هەڵەشە ئەگەر بووترێت کە داروین یەکەمین کەسێکە بیرۆکەی پەرەسەندنی ڕاگەیاندبێت، بیرۆکەکە زۆر کۆنترە لە داروین، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوبوو کە شێوەیەکی تایبەتی پێبەخشی، پاش ئەوەی ساڵانێکی دوورودرێژ لە توێژینەی جیددی کاری دەکرد.

لەهەمان ماوەدا، هەربەرت سپنسەر Herbert Spencer کە پرەنسیپی دەروونناسیی نووسی

له ساڵی ١٨٥٥دا، بایەخی هاوشێوەی بە بیرۆکەی پەرەســـەندن دا. لەنێو ئەو کارانەی کە لە گۆشەی بایۆلۆژییەوە پێشکەشـــی دەروونناسیی کرد، ئەو بڕوایـــە کە دەڵێت خەســـڵەتە وەرگیـــراوەکان لە باوکانـــەوە بـــۆ ڕۆڵەکانییـــان دەگوێزرێنەوە، ئەم بۆچوونەش بە پەرگیری ناوبراو هێرشی کرایە سەر، ویســـمانweismanی ڕەخنەگر هێرشی کردە ســـەر، لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەو وێنە شۆڕشگێڕییەی تیۆری پەرەســـەندن هەیبوو، بەڵام بێبەری نەبوو لە ڕاستی.

هەر لە ڕۆژگاری سپنســـەرەوە دەروونناسەکان ئەو بڕوایەیان لـــەلا گەڵاڵەبوو، کە دەڵێت: هەموو تاکێک خەســـڵەتە نەژادییەکانی بـــۆ دەمێنێتەوە، هەرچەنـــدە هەندێکیان بڕوایان وابوو خەســـڵەتە وەرگیراوەکانی باوک دەگوێزرێنەوە بۆ نەوەکان.

ئەوەی کە داروین و سپنسەر پێشکەشیان کرد بۆ ســـایکۆلۆژیا، شایستە و شـــایانی وتن بوون، ئەویـــش ئەوەبوو ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەســـەر ئەقڵی ئادەمیزاد بە پێویســـت دانرا، نەک هەر لە پەیوەندیدا بە ژینگەوە، بەڵکو بەنیسبەت پەیوەندی بە باکگراوند و پێشینەی بۆماوەییشەوە.

سروشتییە کە ئەو جەختکردنەوەیە ببێتە مایەی وروژاندنی بایەخدان بە دەروونناسیی گیانداران، لە

زانا دیارەکانی ئـــەم بوارەش بریتی بوون لە فابەر Faber، کە لێکۆڵینەوی ســـەبارەت بە ڕەفتاری مێروو ئەنجام دا. زانا ڕۆمانس Romanes کە لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە گیانلەبەران ئەنجام دا، هەڵەی گەورەشـــی کرد لەوەدا کە ڕەفتاری مرۆڤی لە ڕەفتاری گیانلەبەرەوە هەڵهێنجا.

هەروەهـــا زانـــا مـــۆرگان Morgan کـــە شـــێوازی چیرۆکئامێـــزی چەواشـــەی ڕۆمانس-ی زانای ڕاســـتکردەوە، بە پێشکەشـــکردنی یاسای کورتکردنـــەوە Low of Parsimony کـــە بەپێی ئەم یاســـایە وا پێویســـت دەکات ڕەفتاری گیانلەبەر بە ئاسانترین شـــێواز و لەڕێی و وشەی سادە لێکبدرێتەوە، بە مەرجێک هەموو ڕاستییەکان لەبەرچاو بگیرێت.

بۆنموونە دەربارەی ئەوە، چیرۆکی سەگی ئەو شـــوانەیە کە دەچێتە کڵێسا لەگەڵ خاوەنەکەیدا. بە پێودانگی شێوازی چیرۆکئامێزی (تیۆرییەکەی ڕۆمانس) ئەو سەگە دەچێت بۆ کڵێسا، لەبەر ئەوەی وەکـــو خاوەنەکەی دیندارە، بەڵام بەپێی یاســـای کورتکردنەوە، دەبێت بڵێین: ئەو ســـەگە چوو بۆ کڵێســـا لەبەر ئەوەی دەیەوێت لەگەڵ خاوەنەکەیدا بێت. بێجگە لەو زانایانەی ناومان هێنان پێشـــتر، دەبێت ناوی هەریەک لە ســـۆرندایک Thorndike

له ئەمەریکا و کۆهلەر Kohler له ئەڵمانیا بێنین.

زانایەکی دیکه کــه کاری فره لایەن و بایەخی جیاوازی له دەروونناســیدا هەبــووه، پاش داروین و سپنســەر یەکێک بوو لــه لایەنگرانی ئەنگێزەی هەقیقــەت له لێکۆڵینــەوەی ڕەفتــاری مرۆڤ و گیانلەبەرانــدا وەک یــەک. یەکــەم کاری گرنگی سەبارەت به بۆماوەی Hereditary Genius بلیمەتی ئەنجام دا. که به پاڵپشتی تیۆری بۆماوەیی بوو، به ڕای ئــەو: بلیمەتی و هەڵکەوتوویی لەنێو بنەماڵه و خێزانەکاندا دەگوێزرێنەوه، ئەم شــتەش به دیوێکدا ڕاســته و بــه دیوەکەی دیکەدا دەبێت ســڵ له بڕواپێکردنی بکەینەوه، چونکه ناتوانرێت به ئاســانی و تێروتەسەلی توانستی ژیریی شرۆڤە بکرێت و لێکبدرێتەوه.

لەپاڵ بۆماوەییدا پێویسته هۆکارەکانی دیکەش بەهێند وەربگرین، بەتایبەت ئەوەی که پەیوەندیی هەیه بــه ژینگەوه، بۆ ئــەوەی مافیش بدەین به گالتۆن دەبێت به ڕاشــکاوی بڵێین که ئەو هۆکاری ژینگەی فەرامۆش نەکردووه بەتەواوی. هەرچۆنێک بێت لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی بەهرەی خۆڕســکی تــاک، له ئەنجامدا گەیاندیــه بابەتی چاکترکردنی وەچە، واته زانستی چاککردنی ڕەگەزی ئادەمیزاد.

لێکۆڵینــەوی بۆماوەیی تاقــه خزمەتێک نییه

کــە گالتۆن پێشکەشــی ئەم زانســتەی کردبێت، لێکۆڵینەوەکــەی ســەبارەت بــە بیرداهاتــن و خەیاڵکردنەوە بە سروشتی خۆی زیاتر پەیوەندیی هەبــوو بــە دەروونناســییەوە وەک لــە بۆماوە، ئامانجــی لێــرەدا ئــەوە بــوو دۆزینــەوەی ئەو شــێوانەی خەیاڵکردنەوە بوو کە تاکەکان لەکاتی یادکردنــەوەدا بەکاریدەهێنــن. لەنێــو دۆزینەوە گرنگەکانیــدا: یادکردنەوەی بینــراو بووکە لەنێو خەڵکی نەخوێندەواردا بەتایبەت منداڵان باوە.

هەرگیز ئەم لێکۆڵینەوەیــە کۆتایی بە گالتۆن نەهێنــا، چونکــە تا ئێســتا ژمارەیەکــی زۆر لە خوێندکارانی توێژەری ســەرقاڵ کردووە. سەرباری ئەوەش گالتۆن بایەخی زۆری بەتوانســتی ئەقڵی تاک داوە، پشــکنینەکانی ئاماژە بۆ سەرەتای ئەو کارە سەرنجڕاکێشــەرە دەکەن، کە دەروونناســە پەروەردەییەکان لە ئێســتادا پراکتیزەی دەکەن، کاتێک لەڕێی تاقیکردنــەوەی تاکەکانەوە زیرەکی مرۆڤ هەڵدەسەنگێنن.

ئەگەرچــی هەریەکــە لە کاری فســیۆلۆژی و کاری ئەزموونــکاری چێژبەخشــن، بەڵام زۆرینەی هزرەکانی نێو دەروونناســی لە ئەقڵی فەیلەسوف و بیرمەندەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، کارەکانی ئەوانیــش بە دەروونناســی سیســتمی ڕێکوپێک

ناونراوه، كه جوودابوون له سایكۆلۆژیای فسیۆلۆژی و سـایكۆلۆژیای ئەزموونی، دەتوانین بیرمەندان: ئەرسـتۆ و ئۆگەسـتین و ئەفلۆتیـن و دیكارت و كۆمەڵێكی دیكه و لەوانـەش: لۆک و هێربێرت له قوتابی هەمان قوتابخانه و ڕێباز دابنێین.

له پێناوی ئەوەی ئامانجمانه بیگەینێ، دەكرێت چاوێک به كەسـایەتییه سـەرەكییه ناودارەكانی چاخی نۆزدەدا بگێڕین. میل J.S. Mill بەرامبەر بـەو بیرمەندانه وەسـتایەوە، كه بـه بیرمەندانی ڕێبازی پەیوەندیداری (Associationists 1) ناسرابوون، كه باوكیشی یەكێک بوو لەوان.

ئـەو بیرمەند و زانایانه بڕوایان وابوو كه ئەقڵ بریتییه له هزری پەیوەسـت پێكـەوە، بەڵام میل وای دانا ئەوە بەشـێكه له كیمیای ئەقڵ، ئەوەشی بەدرۆخسـتەوە لەبـەر ئەوەی گوایـه نەیتوانیوە چۆنیەتیی باوەڕهێنان به شـتەكان ڕوون بكاتەوە، واته دارشـتنی ڕێسا و دانانی تیۆرییەكان لەهەمان بیر و هزر، ڕەخنەكەی میل ڕاستبوو هەرچەنده به تەواوەتی دانەبڕابوو له ڕێبازی پەیوەندیداری.

یەكەمین كەسێک كه دەروونناسیی به زانستێک و بابەتێكی سـەربەخۆ دانا و به لقێک له لقەكانی فەلسـەفه و فسـیۆلۆژیای دانا، زانا ئالێكساندەر بەیـن Alexander Bain بوو كه كاتی خۆی

بۆ ئەم زانســـتە تەرخانکرد یەکەمین کەسێک بوو کتێبێکی لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دانا.

ئەم کتێبە لە دوو بەشدا دەرکەوت: یەکەمیان: هەستەکان و ئەقڵ ساڵی ١٨٥٥، دووەمیان: ویست و هەڵچوونـــەکان ســـاڵی ١٨٥٩، لە ســـەروەختی دەرچوونیاندا زۆر ســـوودمەند بوون و تا ئێستاش دەتوانین بەپەســـەندکردن و بایەخی زۆرەوە چەند بەشێکی تەواویان لێ بخوێنینەوە.

بەین Bain لـــە هەوادارانی ئەو بیرۆکەیە بوو کە دەیگوت: بۆ تێگەیشـــتنی ئەقڵ بەشـــێوەیەکی ڕاستەقینەیی، دەبێت زانیاریی بنەڕەتی دەربارەی جەســـتە وەدەســـت بێت. بـــەلای ئـــەوەوە ئیدی وتووێژ ســـەبارەت بە پەیوەندی ئەقڵ و جەستەوە نامێنێت، چونکە بە دوو زنجیرەی هاوتەریب وێنای کردبوو. لەو چرکەیەدا کە کردارە ژیرییەکان دەست پێدەکەن، کـــردارە جەســـتەییەکانیش چوونیەک دەست پێدەکەن و بەپێچەوانەشەوە هەر ڕاستە. لە ڕاستیدا ئەم کردار و پرۆسانە بە هەردوو جۆرەکەی لە دوو شـــەمەندەفەر دەچن، کە لەسەر دوو هێڵی هاوتەریب پێشبڕکێ بکەن.

زانـــا بەیـــن Bain بەرامبـــەر بـــە ڕێبـــازی پەیوەندیداری و قبوڵکردنی لەگەڵ بڕوای میل زۆر نزیکن، بەڵام ئەمیان گرنگـــی زیاتریدا بە هۆکاری

تێکۆشـــان و ئەنگێزەکان ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەقـــڵ وەک مەکینە یان ماشـــێنێک کارناکات هـــەروەک چـــۆن ڕێبـــازی کۆنـــی پەیوەندیداری ڕایگەیاند، چونکە چالاکی کاتی ژیری لە دەرەوەی مەملەکەتی هزرەکاندا بوونی هەیە.

لۆتز Lotze فەیلەسوف و بیرمەندی ئەڵمانی جەختـــی لەســـەر پەیوەندی ئەقـــڵ و کۆئەندامی دەمار کردووەتەوە، هەرچەندە کە ئاماژەی بەوەی گۆڕانی ئەقڵ بۆ پەیوەندیی فسیۆلۆژی ئاڵوگۆڕکراو ئەســـتەمە، ئەمـــەش ڕیفۆرمیێکی کاتـــی بوو بۆ ئاڕاستەکانی هزر بوو لەو سەردەمەی ئەودا، کاتێک فسیۆلۆژیســـتەکان ســـەرقاڵی لێکۆڵینـــەوە بوون لەسەر کۆئەندامی دەمار.

لۆتز زانایەکی فســـیۆلۆژی بووە، بەڵام بەهۆی بایەخدانـــە فەلســـەفییەکەیەوە لـــە لێکدانەوەی ماددییانـــەی ئەقڵـــی ئادەمیزاد ئـــازادی بوو. لە هەقیقەتدا ئێمـــەش قەرزارباری ئەوین لە بەرامبەر سەرزەنشت و ئامۆژگارییەکانی بۆ زانایانی ڕێبازی ماددی.

یەکێکی دیکە لەو زانایانەی لە دەروونناســـیی سیستمیدا کۆششیان هەیە، زانا سیلی Sally-ە، کـــە کتێبەکـــەی ســـەرەتایەک لە دەروونناســـیدا جێـــی کتێبەکەی بەیـــن Bainی گرتەوە و وەک

کتێبێکی فێـــرکاری لەنێو خوێندکارەکاندا بڵاوبۆوە و دەخوێندرایەوە.

زانایەکـــی دیکە کــە وارد Wardە کە وتارە سەرنجڕاکێشـــەکەی لـــە چاپی نۆیەمـــی دائیرەی مەعاریفی بەریتانیدا نووســـی، کە پاشتر لە چاپی یازدەیەمدا بەرفراوانتری کـــرد. لەکاتێکدا کە لۆتز گورزێکی کوشـــندەی لە لێکدانـــەوەی مادییانەی ئەقڵ وەشاند، واردیش هەمان هەڵوێستی بەرامبەر بـــە زانایانـــی پەیوەندیـــداری نوانـــد، ئەویش بە پەردەلادان لەسەر نووشووستی ئەوان لە لێکدانەوە و بیانووهێنانەوەی گونجاندنی ئەقڵ و داهێنانـدا.

نووســـەرێکی دیکە لەوانەی بە لێشاو کتێبەکانی دەخوێندرێتـــەوە و دەخوێندرێـــت، زانـــا ســـتاوت Stout–ە کـــە کتێبەکەی کورتەیـــەک دەربارەی دەروونناســـی جێگای بەرزی داگیرکـــردووە لە تاقی کتێبخانـــەی هەمـــوو خوێندکارە کۆششـــکارەکانی خوێندنی دەروونناسیدا.

ناودارتریـــن دەروونناســـی سیســـتماتیکی Systematic Psychology لە ئەمەریکا زانا ولیەم جیمس William James–ە، کە ئەویش وەک زاناکانـــی پێش خۆی لەکایەی فســـیۆلۆژییەوە دەبێتـــە دەروونناس، کە دواجار وەک فەیلەســـووف و بیرمەندێک دەرکەوت، بەڵام پێویســـتی بە ڕوونی

و ئاشـــكرایی بوو. هەر کەسێک بخوازێت دوو بەرگی کتێبەکەی پرەنسیپەکانی دەروونناسی بخوێنێتەوە، ئەوا لە شێوازی خستنەبەر چاوی بابەتەکەیدا هەست بەبێزاری ناکات.

بێســـوودە ئەگەر هەوڵ بدەین کارەکانی جیمس لە بواری سایکۆلۆژیادا کورت بکەینەوە لەم تێڕوانینە کورتەدا سەبارەت بەمێژووی ئەم زانستە.

پێش ئەوەی سایکۆلۆژیا لەنێو زانستەکاندا جێی خۆی بکاتەوە، پێویست بوو کە هەندێک تاقیکاری بەئەنجام بگەیەنێت بۆئەوەی زیاتر بابەتی بێت، لەم بوارەشدا گالتۆن Galton کاری زۆری کردووە.

بەڵام زانای ئەڵمانی واندت Wandt لە شاری لاینبـــرگ، بیرکردنـــەوەی لەســـەر کارێکی گرنگی سەرســـامکەر چڕکردەوە لەبواری ســـایکۆلۆژیای ئەزموونیـــدا، کـــە دواتر دەگەڕێمـــەوە لای واندت و پەیوەندیـــی ئـــەو بەقوتابخانەی دەروونناســـیی تێڕامانـــی ناوەکییـــەوە Psychology Introspective.

لێـــرەدا دەکرێـــت بیـــروڕای ئـــەو زانایە ڕوون بکەینـــەوە کـــە پێـــی وایـــە ئەقـــڵ لەهەســـتی پەیوەســـتیدار پێکهاتـــووە، بەمشـــێوەیە ئەویش دەبێتە لایەنگـــری نزیکی هێربێت لە زانیارییەکانی لەسەر هزر و وێنەی زەینی و زاراوە هونەرییەکاندا،

که دەربارەی تواندنەوەی هــزرەکان و ئاڵۆزییانی نووســـی، زیاتر لەوەش ڕۆیشـــت و ســـەبارەت بە وەرگرتـــن Assimilation قســـەی کـــردووە، واتە وەرگرتنێکـــی میتاپۆلیزمییانە و میتاپۆلیزمی خـــۆراک، کـــە بریتییە لە پرۆســـەی وەرگرتن یان هەڵمژینی هەستێک بۆ هەستێکی دی.

وانـــدت بیرۆکەیەکـــی نوێی بۆ دەروونناســـی پێشـــکەش کرد کە بریتی بوو لە تیۆری هەســـتی ویژدانی سێ ڕەهەندی Theory of Feeling. پێشتر وادەزانرا کە هەســـتی ویژدانی بریتی بووە لـــە خۆشـــی و خەمگینی و مـــاوەی بەردەوامی و قووڵیان، بەڵام بەلای واندت-ەوە ســـێ کۆمەڵە لە هەســـتی ویژدانی جووت جەمسەری هەن و بریتین لە: خۆشـــی و دڵتەنگی، شڵەژان و خاو بوونەوە، هەروەها هێمنی و دڵەڕاوکێ.

لـــە تاقیگەکەی خۆیـــدا لە شـــاری لاینبرگ، زۆرێک لە خوێندکارە بەجۆشـــەکانی خۆیان خستە ژێر تاقیکردنـــەوەی دەروونییەوە، کە واندت خۆی سەرپەرشـــتیی دەکرد و ئامێرێکی بەکاردەهێنا کە بە شـــێوازێکی تایبەت بۆ ئەو مەبەستە دروستکرا بوو بە مەبەستی پێوانەکردنی وەڵامدانەوە ئەقڵییە گونجاوەکان بۆ هەر وریاکەرەوەیەکی جیاواز و جیا لە یەکتری.

تاقیکردنەوەی دیکە ئەنجامدران لەسەر بینین و بیستن و دەستلێدان (بەرکەوتن) و چۆنیەتیی پێوانەی کات و شوێن و پێکەوەبەستنی وشەکان چەند دەخایەنن و چۆن وریایی قڵپ دەبێتەوە و چۆن لەنێوان تاکەکاندا جیاواز دەکەوێتەوە. تاقیکردنەوەش سەبارەت بەچۆنیەتی فێربوونمان بەئەنجام گەیەندرا.

وا چاوەڕوان دەکرا کە سایکۆلۆژی ئەزموونکاری ببێتە هۆی ورووژاندنی ڕەخنە، بەڵام وره و جۆشی ئەوانەی تاقیکردنەوەکانیان ئەنجام دەدا، ڕەخنەگران نەیانتوانی شکستییان پێ بهێنن، هەربۆیەشە کارەکانیان بەجۆش و خرۆش و پلاندارێژییەوە بەرەو پێشەوە ڕۆیشت.

ئەمڕۆش لە بەریتانیا و ئەمەریکا، ئەو خوێندکارانەی بابەتی سایکۆلۆژی دەخوێنن و بۆ وەدەستهێنانی پلەی زانستی، پێویستە چەندان سەعاتی ئەزموونگەریی لەلابۆرەکانی سایکۆلۆژیادا بەسەربەرن. لەڕاستیدا هەردوو دەروونناسان لە شاری ئەدنبەرە د. دریفەر Dr. Drever و د. کۆلنز Dr. Colins ڕاستییان وتووە کاتێک دەڵێن: (ئیدی لەمڕۆوە سایکۆلۆژی بێ بەشی ئەزموونکاری، پارادۆکسێکی مێژووییە)هەر شتێک لە غەیری زەمەنی گونجاویدا ڕوودات. هەروەها

ناتوانین خۆمـــان بەدوور بگرین لە دابەشـــکردنی ســـایکۆلۆژی بۆ لـــق یـــان بەشـــەکانی، چونکە کۆبوونـــەوەی زانیاری بەچەشـــنە جیاوازەکانی و چەندایەتییانەوە، لە ناوەڕاســـتی سەدەی نۆزدەدا توێژەرانـــی هان دا کە بابەتـــی تایبەت هەڵبژێرن و خۆیانی بـــۆ تەرخان بکەن، ئیـــدی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە گەلان وەک لێکۆڵینەوەیەکی دەروونی دەســـتی پێکرد لەلایـــەن بیرمەنـــدان و زانایانی ئەڵمانی هێـــگڵ Hegel و واندت Wandt کە پێشتر باسمان لێوەکرد.

هەروەهـــا زانـــای دەروونی فەڕەنســـی کۆمت Comte و کتێبـــە ئەنترۆپۆلۆژییەکانـــی تایلۆر Taylor و ســـێرجۆن بـــۆک Sir John Lubbock ی تەکانێکـــی بەهێـــزی دایـــە بەر لێکۆڵینەوەی ســـایکۆلۆژی، پاش ئەوانیش ماریت R.R. Marett کـــە بنەچەی ژیاری مرۆڤایەتی خوێنـــد و لێکۆڵییـــەوە. هەروەها زانـــای ئەڵمانی ڤەتیز Waitz لێکۆڵینەوەیەکی تەواوی دەربارەی ژیانـــی هوڤی و دڕنـــدەکان پێشـــکەش کرد، کە پشتی بەبەڵگەی زۆر بەستبوو کە لەماوە جیاکاندا کۆکرابوونەوە.

ماکس موولەر Max Muller خزمەتی خۆی لەم کایەیەدا پێشـــکەش کـــردووە، کە لێکۆڵینەوە

زمانەوانی و ئەفسـانەییەکەی کاریگەریی بەنرخی هەبـووە، هەروەها زانا سـتاینتال Steinthal لێکۆڵینـەوەی ئەنجـام دا لەسـەر پەیوەندیـی دەروونناسی بە زمانە جیاوازەکانەوە.

بـەڵام زانـای فەڕەنسـی ئەمیـل دۆرکهایم Durkheim خزمەتی گەورەی بە سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی پێشکەشـکرد، بـەلای ئەوەوە: هزری مـرۆڤ تەنیـا بەرئەنجامـی چالاکییـە ئەقڵییە تایبەتەکانی خۆی نییـە ، بەڵکو بەرئەنجامی ئەو ژینگـەی کۆمەڵایەتییەیە کە تاک بەشـێکە لێی، بـڕوای بە هەبوونی شـتێک هەبوو وەک ئەقڵی بە کۆمەڵ کە ئەوەش شتێکە لە سەرووی تێکەڵکردنی ئەقڵی تاکەوەیـە لەناو کۆمەڵدا، ئەم زانایە لەڕێی سەرقاڵبوونییەوە بە لایەنی ژیانی دەروونی کۆمەڵە بەرایـیـەکان بـەم بیرۆکەیە گەیشـت، هەرچەندە تیۆرەکەی سەرنجڕاکێشە، بەڵام مرۆڤ هەستدەکات بێتوانابـووە لـەوەی لەڕێی بەڵگەی زانسـتییەوە پشـتگیریی تیۆرەکەی بکات. بـەڵام ئەو تیۆری ئیلاسـتیکی تر لە تیۆرەکـەی داروینیزمدا ڕەگی داکوتـی بوو، کـە پەرەسـەندنی ئەقڵی مرۆڤی لەنێـو ژینگەی کۆمەڵایەتیـدا ڕوونکردەوە، لەبری ئەوەی بڕوا بە ئەقڵـی کۆمەڵی بهێنرێت، هەردوو زانایان ستانلی هۆل Stanly Hall-ە و بالدوین

Baldwin توێژینەوەیان دەربارەی لە چۆنیەتی پەرەســـەندنی ئەقڵی مرۆڤ ئەنجــام دا لەمیانەی کارلێککردنی ئەقڵەکان پێکەوە لەنێو کۆمەڵدا.

یەکێکی دیکە لەو زانایانەی خزمەتێکی بەرچاوی پێشکەش بە ســـایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی کردووە، زانا ماکــدۆگل Mcdougal بوو کە کتێبەکەی سەرەتایەک دەربارەی ســـایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی ساڵی ۱۹۰۸ کاریگەری گەورەی هەبووە بەسەر ئەم زانستەوە.

بەڵام سۆرندایک Thorndike لێکۆڵینەوەی ئەنجــام دا دەربارەی سروشــتی بنچینەیی وردی مــرۆڤ لەبەر ڕۆشــنایی ســـایکۆلۆژیای ئاژەڵاندا، لەگەڵ جەختکردنەوەی تایبەتی لەســـەر ئامانجی ئەنگێزەیی لەنێو سروشتی خۆیدا. لەم ڕۆژگارەشدا ســـەبارەت بەم بابەتە نووسینێکی نووساوە، وەک زانا ڕیڤەرز Rivers لە کتێبەکەیدا (دەروونناسی و زانستی ڕامیاری) کە ساڵی ۱۹۲۳ نووسیویەتی، زانا ترۆتەر Trotter لە کتێبەکەیدا ئەنگێزەکانی مێگەل لە ئاشــتی و شــەڕدا، پێــش ئەویش زانا گراهــام والاس Graham Wallas کتێبــی سروشــتی ئادەمیزادی و زانستی ڕامیاری نووسی، هەروەها زانا باگیهۆت Bagehot ســـەبارەت بە سروشتییەکان و زانستی ڕامیاری نووسی.

سـهبارهت بـه سـايكۆلۆژیای منـدالٚ، وهک سایکۆلۆژیای کۆمهڵایهتی و سایکۆلۆژیای ئاژهڵان، بهشـێوهیهکی گشـتی ڕهگی خۆی ههیـه لهنێو دۆزینهوه پێشکهوتووهکانی سـايكۆلۆژیادا. بهڵام وهک بابهتێکی سـهربهخۆ، تهمهنی له سهدهیهک تێناپهڕێت، پێش ئهو مێژووهش تهنیا بریتی بوو له چهند کتێبێکی پهرشوبڵاو دهربارهی ڕهفتاری نامۆ یان ناوازهی تێبینیکراو لای منداڵان.

یهکهم لێکۆڵینهوهی ئاشکرا لهسهر ئهقڵی منداڵ له سـاڵی ١٧٨٦دا دهرکهوتـووه، کاتێک تیدمان Tiedmann کتێبێکی نووسی بهناوی دهفتهری تۆمارێک بۆ ژیانی منداڵ که لهسـاڵی ١٨٧٧دا بۆ زمانی ئینگلیـزی وهرگێڕدرا، ههروهها زانا چارلس داروین خۆشـی بایهخی گهورهی بهم بابهته داوه و ماوهیهکـی زۆر تۆمارێکی پهرهسـهندنی ژیانی ڕۆژانهی لای خۆی ههڵگرتبوو.

جیمـس سـیڵی James Sallyیش ئهم بابهتـهی بههێزترکـرد له دووتووێـی کتێبهکهیدا بهنـاوی سـایکۆلۆژیای منداڵی که سـاڵی ١٨٩٥ بڵاوی کردهوه، پاشان زانا بالدوینً یش له ئهمهریکا تهکانێکی دیکهی بهم بابهتهدا و کتێبێکی نووسی سهبارهت به پهرهسهندنی ژیریی له منداڵ و وهچهدا ههروهک چۆن پێشتر کتێبهکهی ترهیسی Tracy،

دەروونناســـی قۆناغی منداڵی هەمان ڕۆڵی بینی، هەروەها پێویستە بەتایبەتی باس لە زانای ناوداری فەرەنســـی ستانلی هۆڵ بکەم، کە یەکەم تاقیگەی لە ئەمەریکادا و لە ساڵی ١٨٨٣دا بۆ لێکۆڵینەوەی دەروونناسی ئەزموونکاری کردەوە.

پێویستە کە کۆششـــی قوتابخانەی فەڕەنسی بە ســـەرۆکایەتیی بێنێـــی Binet لە بیر نەکەین و چاوپۆشـــیی لـــێ نەکەین، کە یەکەم کەســـبوو تاقیکردنەوەکانی زیرەکی داهێنا و بۆ پێوانەکردنی زیرەکی منداڵ دیزاین کرابوو، کە پاشـــتر گەشەی پێدرا و بۆ مەزەندەکردنـــی زیرەکیی گەورەکانیش بەکارهێنرا.

پێوانەکردنـــی گـــەورەکان، ئەمڕۆ لە ســـوپادا پراکتیک دەکرێت لەلایەن کۆمەڵێک لە دەروونناسە ڕاهێنەرەکانـــەوە لەو بـــوارەدا، هەروەها ئیتاڵیاش لـــە لێکۆڵینەوەی دەروونناســـیی منداڵدا خزمەتی جۆراوجـــۆری پێشکەشـــکرد لەمیانـــەی میتۆدی پەروەردەیـــی مەدام خاتوو مۆنتیســـۆری و زانای ئەڵمانـــی کۆفـــکا Koffka-ش لە گەشـــەکردنی ئەقـــڵ-دا ســـەرەتایەکی لە ســـایکۆلۆژیای منداڵ پێشکەشکرد.

لـــەو لێکۆڵینەوانەش کە شایســـتەی بایەخە لە ســـایکۆلۆژیدا، لێکۆڵینەوەی ئەقڵی ناوازەبوو، بڕوام

وایە کە ڕاســـتگۆییە کە بووترێت ئەم لێکۆڵینەوەیە لە هەموو بەشەکانی دیکەی ئەم زانستە زیاتر سۆزی جەماوەری بەرەو لای خۆی کێشکرد. مرۆڤ دەتوانێت ئەوەش بڵێت کە سەرنجڕاکێشان بۆ ئەم بابەتە ئەوەندە بەهێزبـــوو، بـــووە هۆی دەرکەوتنی جـــۆری دیکەی ســـایکۆلۆژیای میللیی ساختە کە زیاتر لە جادووەوە نزیکبوو، کە وا پێویســـتی دەکرد خوێندکاری بواری سایکۆلۆژی، لەڕێی خوێندنەوەی زیرەکانە و هۆشیاریی ئەم بابەتەوە، خۆی لێیان بپارێزێت.

جۆرێکـــی دیکەی ســـایکۆلۆژی کـــە ئاماژەی پێـــدەدەم لێـــرەدا، بریتییـــە لـــە ســـایکۆلۆژیای نەخۆشـــی (٢) Psychopathology یـــان ئەوەی کە هەندێجار بە ســـایکۆلۆژیای قوڵاییەکان Psychology depth ئاماژەی بۆ دەکرێت، چونکـــە توێژینەوە لـــە قوڵایی مێشـــکدا دەکات ســـەبارەت بەزانینـــی هۆکارە جیاکانـــی ڕەفتاری مرۆڤ، چ سروشتی بێت چ ناوازە و دانسقە بێت.

ڕاســـتە ئەگەر بووترێت چاکبوونەوەی دەروونی ســـەرەتاکەی لە نۆژدارییەوە سەرچاوەی گرتووە، نەک لە هیـــچ لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیی جیددی سایکۆلۆژیدا، پەیوەستییەکی زۆر پتەوی بەمێژووی خەواندنی موگناتیســـییەوە هەیە، کە یەکەمجار لە میانەی مێســـمەرییزم Mesmerism لە ساڵی

١٧٣٤-١٨١٥ دا پێشکەشـــکرا کە زانا مێســـمەر Mesmer دایهێنـــا لە دووتوێـــی تیۆرییەکەی خەواندنـــی موگناتیســـیداو وەک شـــێوەیەک لـــە شـــێوەکانی خەوتن کـــە نۆژداریـــی دەروونی بۆ نەخۆشەکانی خۆی دەخولّقێنێت.

مێســـمەر بڕوای وابوو، کە بڕواکەشی هەڵەبوو، لەڕێی ڕەوانەکردنی شلەی مووگناتیسیی تایبەتەوە لە پزیشـــکەوە بۆ نەخۆشەکەی دۆخی نووستن بۆ نەخۆشەکە فەراهەمدەکرێت بەشێوەیەک پێشنیازە چارەســـەرییەکان شیاو دەبێت، کە هەندێجار وەک دۆخێـــک لە چارەســـەرکردنە نەشـــتەرگەرییەکان بەکاردێت. کاری هاوشـــێوەی ئەمەش لە شـــاری نانســـی لە ســـاڵی ١٨٦٤دا لەلایـــەن زانا لیبۆڵت Liebeault-ەوە، هەروەها لەلایەن قوتابخانەی خەواندنی مووگناتیســـی پاریســـەوە کە جارکۆت Charcot ســـاڵی ١٨٧٨ سەرۆکایەتیی دەکرد، هەروەهـــا جانێـــت Janet کـــە هەردووکیـــان کاریگەریی یەک نۆژدارییان بەسەرەوە بوو لە شاری ڤییەننـــا ئەویش فرۆید Freud بوو، کە وازی لە خەواندنی موگناتیسی هێناو بەرە و شێواز و میتۆدی هاوپەیوەندیی ئـــازاد FreeAssociation و لێکدانـــەوەی خەونەکان، کاریکـــرد و توێژینەوە و دەرئەنجامەکانـــی بووە جێگە بایەخی نۆژدارەکانی

دیکــە. لەوانەش بــاس لە دووانیــان دەکەین کە ئەوانیــش د. ئادلــەر Dr. Adler و د. یۆنگ Dr. Yung بوون، دواجار لەگەڵیدا ناکۆک بوون و لــە توێژینەوەدا بەردەوام بــوون بۆ دۆزینەوەی لێکدانەوەی جیاواز سەبارەت بە پاساوهێنانەوە بۆ نەخۆشییە ئەقڵییەکان.

فرۆید لە تیۆرەکەیدا جەختی لەسەر چەپاندنی سێکسی منداڵی کردەوە، ئادلەریش ئەو چەپاندنەی دایــە پاڵ مــن Ego یان مەیــل و ڕەوتی خود ســەلماندن، لە ساڵی ١٩١٢شــدا قوتابخانەیەکی ڕکابەری دامەزراند بەنێوی قوتابخانەی سایکۆلۆژیای تاکێتــی. بــەلای فرۆیــدەوە هــۆکاری بنەڕەتی بــۆ نەخۆشــییە نیرۆسســیەکان Neurosi, disease، واتە نەخۆشــیی دەمــاری ئەقڵی، لە خۆشەویســتیی شکســتهاتووی نێوان منداڵ و باوانەوە ســەرچاوەی گرتووە، بەتایبەتی لەنێوان ڕەگەزە جیاوازەکاندا.

لەکاتێکــدا ئادلەر بڕوای وایــە کە هۆکاری ئەم حاڵەتانە دەگەڕێتەوە بۆ هەســتبەکەمیکردن کە لە سەرەتای ژیانی منداڵییەوە دەستپێدەکات و کەڵەکە دەبێت، بەهۆی ئەو هەستکردنەش منداڵ تێدەکۆشێت قەرەبــووی ئەو دۆخــە بکاتەوە بە کۆششــکردن لەپێناوی سەرکەوتن بەسەر ئەوانی دیکەدا.

بۆ وەدەستهێنانی ئەو ئامانجەش، ئەو ڕێگەیەی لە منداڵیدا دەیگرێتەبەر نموونەیەکە لەو ڕەفتارەی کە ساڵانی پاشتر دەیگرێتەبەر، بۆ وێنە کەللەڕەقی منداڵ شـــێوازێکە بۆ وەدەســـتهێنانی سەرکەوتن، بەهەمان شـــێوە ئامڕازێکـــە بۆ وەدەســـتهێنانی ئامانجەکانی لە ســـەروەختی باڵقبوونـــدا، ئەگەر توانیی لەڕێـــی خۆنەخۆشخســـتنەوە ئامانجەکانی وەدەست بهێنێت، ئەوا هەست بە نەخۆشی دەکات، هەرکاتێک نووشوستی دێنێت لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەڵوێســـتانەدا کە لـــە قۆناغـــی باڵقبوونیدا دووچاری دەبنەوە.

یۆنگ هەســـتی بەوەکرد کە هەریەک لە فرۆید و ئادلـــەر نەیانتوانـــی لێکدانەوەیەکـــی کامـــڵ و تەواو بۆ نەخۆشـــیی دەماریی ئەقڵی پێشـــکەش بکـــەن، ئەو جەختـــی لەوە کردەوە کـــە هۆکاری ســـەرەکیی ئەم نەخۆشـــییە بریتییە لە نوشوستی وزەی ئەقڵـــی یـــان وزەی ژیـــان (Libido3) –لیبیدۆ- بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڵوێستی تایبەت. شـــێوازی چارەســـەری نەخۆشـــیش لەوەدایە کە وزەی پەنگخواردنـــەوەی ناخ فـــڕێ بدرێتە دەرەوە و ئاڕاستەی ئەو هەڵوێســـتانەی پێشوو بکرێنەوە کە لە ناخدا گیریانخواردووە، شـــێواز یان میتۆدی بەکارهێنراوی ئادلەر بریتی بوون لە هاوپەیوەندیی ئازاد و شـــیکاری خەون لەسەر شێوازەکەی فرۆید،

بەڵام بە ئامانجێکی جیاوازەوە.

ئامانجی ئەوەبوو کە هەڵوێستی نەستیی نەخۆش ئاشکرا بکرێت لەو کێشـــە هەنووکەییەی هەیەتی، ئامانجەکـــە بریتیبوو لە لێکۆڵینەوە ســـەبارەت بە ئارەزووی سێکسیی منداڵی کە بەدی نایەن.

ئەو قوتابخانەیـــەی کە یۆنـــگ بەدامەزرێنەی دادەنرێت بە قوتابخانەی دەروونشیکاری دەناسرێت کـــە ناکرێت تێکـــەڵاو بکرێـــت لەگـــەڵ هونەری دەروونشیکاری، کە فرۆید دایهێنا.

دەربارەی ئەو سێ قوتابخانەیەی دەروونشیکاری نەخۆشی تێبینی زۆرم هەیە کە بتوانم بیڵێم، بەڵام کات و شـــوێنەکە بواری ئەو ئاخاوتنە نادات، بەڵام ڕەنگە کاتێک کە خوێنەر لەدوای خوێندنەوەی ئەم بابەتـــە دەبێتەوە لە ناخیدا ئارەزووی ئەوە دەکات کە بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە بکات، دەشتوانێت لیســـتی کتێبی گونجـــاو لەم بارەیەوە بەئاســـانی بەدەست بهێنێت.

لەو نێوانەشدا ئەو کتێبانەی زانایانی دیکە دەست دەکەوێت کە بەشێوەیەکی ڕەها لایەنگری فرۆید یان ئادلەر یـــان یۆنگ ناکەن، ئـــەوەش ڕاناگەیەنن کە قوتابخانـــەی تایبەت بەوان دابمەزرێت، ئەوان لەنێو شێوازە جیاوازەکاندا هەڵبژاردنیان کردووە، شێوازی چارەســـەری ئەوان پشت بەو زانیارییانە دەبەستێت کە زیاتر لە قوتابخانەیەکەوە چنگیان کەوتووە.

پەراوێزەکان:

١- میتۆد یان ڕێبازی پەیوەندیداری (المذهب الترابطی) بریتییە لەوەی کە ژیانی ئەقڵی وەها لێکدەداتەوەو لە دەرئەنجامی پەیوەندییەکان کە لەنێوان هەستەکان و واتاکانیدا ڕوویان داوە، کە دەبنە پاشماوە و ئاسەوار بۆ هەستەوەرییەکان. (معجم مصطلحات علم النفس/ أستاذ منیر وهیبە الخازن ص٢٤).

٢- سایکۆلۆژیا بۆ شیکردنەوەی نەخۆشییەکان بریتییە لە لیکۆڵینەوەی هۆکار و ئەرک و پرۆسە ئەقڵییەکان لە دۆخی نەخۆشیدا، هەروەها لێکدانەوەی گشت پشێوییە دەروونییەکان، لێکدانەوەیەکی سایکۆلۆژییانە نۆژداری ئەقڵیش بریتییە لە جێبەجێ کردنی سایکۆلۆژی نەخۆشی لەبواری خۆپاراستن و چارەسەریدا. (معجم مصطلحات علم النفس ص ١١٩).

٣- فرۆید ناوی لیبیدۆی بەسەر وزەی زیندووی ئەنگێزەی سێکسی بەخشی، جەختی لەوەش کردەوە کە تەنیا وزەی ئەنگێزەی سێکسی ببەخشێت. بەڵام یۆنگ ئەم زاراوەیەی بەرفراوانتر کرد بەوەی کە وزەی دەروونغی زیندووی گشتیش بگرێتەوە، وای دەبینی کە ڕواڵەتەکانی چالاکی ئادەمیزادی زیاتر

بەرفراوانـــن و لێکـــدراو و تێکەڵترن لەوەی کە هەموویان بدرێنە پاڵ ئەنگێزەی سێکســـییەوە، بەڵکـــو وزەی ئادەمیزادی هۆکارە سێکســـی و ناسێکسییەکانیشـــی تیادا تێکەڵ دەبن. (معجم مصطلحات علم النفس).

**سەرچاوە:**

علم نفسک علم نفس، تألیف: الدکتور و. أی ســـارجنت/ ترجمە: باحثە الجومرد/ عدد ٢٦٩-٢٧٠/ ١٩٨٦/ بغداد ل١١-٥٤.

# سەرەتاکانی پەروەردەناسی
# یان فەلسەفەی پەروەردە (*)

## چەمکی فەلسەفە چییە؟

فەلسـەفە لە سـەرەتاوەو بەر لە هەر شـتێک، زاراوەیەکی یۆنانییە، کە لە دوو واژە «لفظ» پێکدێت: فیلا philo کە بەمانای خۆشەویسـتییە، سـوفیا sophy کە دانایی دەگەیەنێ. بەمەش فەلسـەفە دەبێتـە "خۆشەویستی دانایی".

چەمکی فەلسەفە تووشی دەستکاریی زۆر هاتووە بەشێوەیەک کە بووە بە کارێکی سەخت مرۆڤ بتوانێ پێناسەیەکی گشـتگیر دابڕێژێ کۆی ئەو پێناسانە بگرێتە خۆی کە فەلسەفەکان پێشکەشیان کردووە. لە ڕاسـتیدا ئەم دەسـتکارییانەش گوزارشـت لەو گۆڕانە ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو کولتوورییانە دەکەن، کە تووشـی سەردەمە مێژووییە جیاوازەکان هاتوون (١).

پێناسە بۆ چەمکی فەلسەفە لە مێژووی خۆیدا، ئەرستۆی فەیلەسـوفی یۆنانی پێی هەستاوەو بۆ

ئەوە چووە، کە فەلســەفە "لێکۆڵینەوەیە لەبوون بەوەی کە هەبووە (موجود)ە". ئەم دیاریکردنەی فەلســەفە دەیکاتە هەوڵێکی عەقڵیانە کە ئامانجی کەشــفکردنی حەقیقەتێکی نوێیە یاخود مەیلێکی عەقڵییە کە هەســتکردن بە نەزانــی پاڵنەریەتیو چێژی عەقڵی هاندەریەتی، نە خواســتی عەمەلیو نە بیروباوەڕی ئایینــی ڕێنماییکەر نین بۆی، ئەم هەوڵە عەقڵییەش لە کۆندا بە زانست ناوزەدکراوە.

لێرەوەیە کە گوتراوە زانستو فەلسەفە لە یەک ڕیشەوە هاتوون، هاوڕێ بە یەکتری هاتوون هەتا لە سەرەتای سەردەمی نوێدا لە یەکتری جیادەبنەوە. بەڵام چەمکی فەلسەفە (هەمووارکردنی) ڕێکسازی "تعدیــل"ی بەســەردا دێت لە قۆناغی شکســتی ژیاری یۆنانیدا لەم قۆناغەدا فیکر بەگشــتی ڕوو لە پووکانەوە بوو لە ناویشیدا فەلسەفە، بەمەش وازی لــە بیرکردنەوە لە بوون هێنــاو کەوتە توێژینەوە لە ڕەفتاری مرۆڤو ڕووی لە بەختەوەریی فەردیو ئارامیی نیگەتیڤانە کرد، ڕەنگە ئەم وەرچەرخانەی چەمکی فەلسەفە لەو پێناسەیەدا تێبینی بکەین کە قوتابخانەی ڕەواقییەکان (stoics) پێشــنیاری کردبوو، کە پێی وابوو فەلسەفە بریتییە لە "هونەری فەزیلەتو هەوڵی هێنانەدی لە ژیانی عەمەلیدا".

لە پێناســەی قوتابخانەی ئەبتمۆریشدا دیسان

تێبینـــی دەکەیـــن کـــە فەلســـەفە لای (ئەبیقۆر Epicurus) بریتییـــە لە هەوڵـــدان بۆ ژیانێکی بەختەوەر بـــە بەکارهێنانی عەقـــڵ ..."، بەوەش ئەم پێناسانە فیکریان بە ژیانی کردەییەوە گرێداو واقیعی ئەو ڕۆژگارەش ئەمەی دەویست.

لە کۆتایی ئەم سەردەمە مێژووییەشدا ڕێکسازی "تعدیل"ییـــەک ڕووی دا، کە بـــووە مایەی ئەوەی فەلســـەفە هەموو مانایەکی خۆی لەدەســـت بدات، ئەمـــەش کاتێک ڕووی دا کە گیانی ســـۆفیگەرایی بەسەر بیرکردنەوەی لۆژیکییانەی فەیلەسوفەکاندا زاڵبوو، فەلسەفە بە گوێرەی گوزارشتی (زیلەر) بوو بە "کۆششێک کە لە هەوڵی کۆکردنەوەو گونجاندنی نێوان لۆژیکی عەقڵی خۆرئاوایی سۆفیزمی ئایینی خۆرهەڵاتیدا بوو". (٢)

لە چاخەکانی ناوەندیشـــدا چەمکی یۆنانیانەی فەلســـەفە هەژموونی پەیدا کردەوە، بە شێوەیەکی تایبەتیش لە دانانیدا بە ئارەزوویەک بۆ خواســـتی حەقیقەت لە پێنـــاوی خودی خۆیدا، لەهەمانکاتدا تێبینیی ئەوەش دەکەین کە تێگەیشتنێکی دیکە بۆ فەلسەفە لەو سەردەمەدا هاتە ئاراوە، کە هاوڕێکی چەمکە یۆنانییەکە بوو، کە ئەو تێگەیشـــتنە بوو و جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە فەلسەفە "هەوڵی گونجانی نێوان وەحیو عەقڵو ئارەزووی گونجاندنی

نێوان دەسەڵاتی عەقڵی کۆنو دەسەڵاتی ئایینی نوێیە"، چەمکی فەلسەفە لای قەشە " ئەنسلم" بەمشێوەیەیە.

چەمکی یۆنانییانەی فەلسەفە لای فەیلەسوفانی عەرەب دەنگیدایەوە، فاراپی لە کتێبەکەیدا "بەیەکەوە کۆکردنەوەی ڕای دوو دانیارەکە "، فەلسەفە بەم گوتەیەی پێناسە دەکات: (زانستە بە هەبووەکان بەو پێیەی کە هەبوون "موجود").

بۆ حیکمەتی ئیلاهیو سروشتیو لۆژیکیو ماتماتیکیشی دابەشکردو وای دەبینێت کە هیچ شتێک لەنێوان هەبووەکانی جیهاندا نییە، کە فەلسەفە دەخالەتی تێدا نەبیّو مەبەستێکی تێدا نەبیّ.

لە سەرەتای سەردەمی نۆیشدا نوێکارییەک لە چەمکی فەلسەفەدا ڕووی دا، ڕەنگە ئەم نوێکارییەش بگەڕێتەوە بۆ خەمی فەیلەسوفانی چاخی نویّ بۆ دامەزراندنی فەلسەفەیەکی نویّ، ئیدی خاوەنانی ئاراستەی عەقڵی لەسەر عەقڵ بنیادیانناو خاوەنی ئاراستە ئەزموونگەرایەکەش "الاتجاە التجریبی" لەسەر تێبینیو ئەزموون دایانمەزراند، لە دەرەنجامی ئەم وەرچەرخانەش لە چەمکدا فەلسەفەی نویّ ڕوویکردە توێژینەوە لە مەعریفەداو گرنگیی بە لێکۆڵینەوەی سروشتەکەی

دا، بەمەبەســتی وەستان لەســەر حەقیقەتی ئەو پەیوەندییەی هێزەکانی ئیدرالو شتە دەرككراوەکانی پێکەوە دەبەستێتەوە، بەمشێوەیە فەلسەفەی نوێ چەند مەزهەبێکــی دژی یەکتــری بەرهەمهێنا لە نموونەی: میســالییەتو واقیعییەتو "حدسیە"و، "وضعیە"و گومانگەراییو یەقینگەرایی....

هاوچەرخ لە مێژووی فەلســەفە دێت بۆئەوەی هەڵگــری ڕێکســازی "تعدیل"ێکی ڕیشــەیی بێت لە تێگەیشــتنیدا بۆ چەمکی فەلســەفە، ئاشکرایە فەلســەفە هاوچەرخەکان چەمکی فەلسەفەیان لە لێکۆڵینــەوەی بــوونو مەعریفەوە بــۆ توێژینەوە لــە بوونــی مــرۆڤ گواســتویانەتەوە، ئەمەش وەرچەرخانێکی گەورەبووە لە مێژووەکەیدا. (٣)

بــەم ڕێکســازییەش چەمکی فەلســەفە لای یەکێک لە مەزنترینی فەلســەفە هاوچەرخەکان کە "پۆزەتیڤیزمی لۆژیکگەرا :الوضعیه المنطقیه"یە، بووە بە "کارێکی شــیتاڵگەرانە ڕووتە نەک کەشفکردنی حەقیقەت ئەرکی فەلســەفە لە دیاریکردنی مانای واژە "لفظ"ەکانــدا کورتبووەتــەوە کە دیاریکردنی پێناســەکان هاوکاریمان دەکات". هەروەها بەوەی مەســەلەکانی زانســت بە ڕوونی دیــاری بکاتو پەیوەندییە لۆژیکییەکانی نێوانیان ئاشــکرا بکات لەگەڵ ڕەمــزە بەکارهێنــراوەکان تێیاندا، بەوەش

فەلســـەفە بە ڕای ڕیخنباخ بووە بـــە "ڕوونکردنی مانای واژەکان لە ڕێگەی شیتاڵکاریی لۆژیکییەوە". (٤)

بەرتراند ڕەســـلیش داوای زەرورەتی بەخشین سیماو ڕەنگێگی زانســـتییانەی ڕووت بە فەلسەفە دەکات، ئـــەوەش بەڕای ئەو هـــەق وایە ئەحکامو پێـــوەرە بنەڕەتییەکانـــی خۆی، لە زانســـتەکانی سروشـــتییەوە هەڵبگۆزێـــت، هەروەهـــا پێی وایە پێویستە فەلسەفە تەبەنیی میتۆدێکی شتیاڵکارانە بکات، کە ئامانجی لابردنی تەمومژبێت لە تێڕوانینە فیکرییە ئەبستراکتەکانو ڕوونکردنەوەی مەسەلەو بەڵگە زانســـتییەکان، کە فەلســـەفە ئـــەم ڕێگایە نوێیەی هەڵبـــژارد دەتوانێ چەنـــد دەرەنجامێکی پۆزەتیڤانەی وامان پێشکەش بکات، کە لەسەرووی ئـــەو چارەســـەرە ئەبســـتراکتگەراییانەوە بن کە ئێمەیان لەسەر ڕاهێناوە. (٥)

پراگماتیزمیـــش پـــڕۆژەی نوێکردنـــەوەی بۆ فەلسەفە پێشنیارکردووە "دێوی" بۆ ئەوە دەچێت کە پێویستە فەلســـەفە لە ئایندەدا پەیوەندییەکی پتـــەوی بەوەوە هەبێت، کە ڕوودەدات لە کاروباری مرۆڤایەتی لە قەیرانو حاڵەتی سەختدا.

بانگەشـــە بۆ ئەوە دەکات لە دۆگمایی قســـە دەربچینو "دەخالەتی بە ژیانی واقیعییەوە نەبێت"و

بگۆڕدرێـــت بـــۆ چالاکییـــەک کە لە چارەســـەری کێشـــەکانی ئەم ژیانەداو لە پێکهێنانی زانستێکی مرۆییدا بەشداربێت، کە بشێ ببێتە پێشەکییەک بۆ نوێکردنەوەی حاڵی ژیانی مرۆیی‌و بانگەوازبێت بۆ پابەندبوون بە یاساوە، بۆ ئەوەی ژیانێکی باشترو بەپتتر بژین. (٦)

لێـــرەدا دەوەســـتین‌و دەڵێیـــن: ئامانجەکانی فەلســـەفە کامانەن؟ گرنگترینی ئەوەی فەلســـەفە هەوڵی بۆ دەدات دانانی تێگەیشـــتنێکە بۆ هەموو ئەوەی دەکەوێتە چوارچێوەی ئەزموونی مرۆییەوە، لەم هەوڵەشـــیدا چەند ئامانجێکـــی دیاریکردووە، لەوانەش:

١-هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە سروشتی شتەکان شـــتێکی زانراوە کە ئـــەم کایەیە لە فەلســـەفەدا بـــە زاراوەی "ئەنتۆلۆژیـــا Antologg" ناوزەد دەکرێت.

٢-هەوڵـــدان بـــۆ لێکۆڵینـــەوەی ڕێبازەکانی بیرکردنـــەوەو ئـــەو ئامرازانـــەی لـــە مەعریفەدا بەکاریان دەهێنێ، فەلسەفە زاراوەی ئەبستمۆلۆژیا Epistemology بۆ ئەم کایەیە داناوە.

٣-هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوەی کێشـــەی ڕەفتاری مرۆیی‌و چارەســـەرکردنی بەهەمان ئەم باســـەش

فەلسەفە بە ئەکسـیۆلۆژیا "Axiologg" ناوی دەبات. (٧)

دەگەڕێینەوەو پرسیار دەکەین: ئەرکی فەلسەفە چییە؟ بریتییە لەم ئەرکانە:

**١- ئەرکی ڕۆشنبیرییانەی فەلسەفە:**

یەکێک لە گرنگترینی ئەو ئەرکانەی فەلسـەفە پێیان هەڵدەستێت ئەوەیە کە تێڕوانینی (فەلسەفە) دەیخاتـە بەردەسـتی مـرۆڤ کـە هەلومەرجی دیاریکردنی هەڵوێستەکەی لە بەرامبەر ڕۆشنبیرییە باوەکاندا دیـاری دەکات، بەمەش ئەوەیان دیاری دەکات کە ئارەزووی لێیەتیو ئەوەش ڕەفز دەکاتو لای دەبات کە دەیەوێت، بـەڵام ئەم هەڵبژاردن و وەلانانـە لەگەڵ ئەو فەلسـەفەیەدا ڕێگە دەگرێتە بـەر کە تاک یاخود ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژی کردوویەتی پەیڕەوی دەکات، فەلسـەفە لەسـەر ئـەم بنەمایە دەگۆڕدرێت بـۆ پێوەرێک کە جۆری ئـەو ڕۆشـنبیریو فەرهەنگە دیـاری دەکات، کە هەڵیدەبژێرێتو ڕۆڵو ئەرکەکەشی دیاری دەکات.

**٢- ئەرکی کۆمەڵایەتییانەی فەلسەفە:**

یەکێک لە ئەرکەکانی تری فەلسەفە ئەوەیە کە هەلی ئینتیما بۆ کۆمەڵ بۆ مرۆڤ دەڕەخسـێنێ.

زانراویشه کۆمەڵ لە چەند هێزێک پێکدێت، کە چەند بەرژەوەنـــدیو پەیوەندیگەلێکـــی خۆیانیان هەیە، هەر یەکێکیش لەم هێزانە خاوەنی فەلســـەفەیەکە هەڵوێستەکانی دیاری دەکات لە ناوەوەو دەرەوەی کۆمەڵگەدا، لەهەمان کاتیشیدا دیدە مێژووییەکەیو هەڵوێستیشی لە سەردەم دیاری دەکات.

فەلسەفە لێرەدا دەگۆڕدرێتە سەر ئایدیۆلۆژیا، دەبێتە هێزێکی کارا لە کۆمەڵگەدا، بۆ پێشـــەوەو بۆ دواوە دەیجولێنێ، بەوەش تاک دەکاتە خاوەنی هەڵوێســـتێک کە وای لێدەکات "هەســـت بە ژیانی خۆیو بوونی بکات، وەک مرۆڤ". (٨)

**٣- ئەرکی زانستیاریی فەلسەفە:**

لـــە گرنگتریـــن ئەرکەکانی فەلســـەفە دانانی چوارچێوەیەکی گشتییە بۆ زانستو دارشتنی تیۆرو گوتەزاکانی مێژووی فەلسەفە، چەند شێوەیەکی لە وەسێتو ئامۆژگاریی فەلســـەفە بەسەر گۆڕەپانی زانستدا.

مێژووی زانســـت چەند شـــایەتییەکی زۆرمان پێشکەش دەکات کە سەلمێنەری پتەویی پەیوەندیی پتەوی نێوان زانستو فەلسەفەن، لەو سۆنگەیەوە کە کۆی ئەو زانایانەی شـــۆڕش زانستی گەورەیان بەرپاکردووە فەیلەسوفبوون، ئەرکی فەلسەفەش لە

ئەمرۆدا بووە بە دارشـــتنی چەنـــد گریمانەیەک بۆ زانست کە بۆ هەڵبژاردنی چەند ڕێبازێکی نوێ هانی دەدەن بۆ دڵنیابوون لەو گریمانانە، بەم شـــێوەیە زانست دەرەنجامە دروەشاوە دەهێنێتە دیو ڕۆڵی فەلسەفە دەبێتـە وێنەکێشانی دیدێکی ئایندەیی بۆ زانست. (٩)

کەســـانێکیش هەن بە دیدێکی دیکە بۆ ئەرکی فەلســـەفە دەڕوانن، وێنەی ئەو تـــەواو دەکات کە فەلســـەفە هەڵدەستێت پێی، ئەم تیڕوانینەش ئەم ئەرکانە دیاری دەکات:

**١- ئەرکی ڕەخنەگرانەی فەلسەفە:**

فەلســـەفە بـــەکاری ڕەخنەیـــی ئـــەو چەمکو گریمانەو بەڵگەنەویستانە هەڵدەستێت، کە زانایان بـــەکاری دەهێنن لـــە هەر کایەیەک لـــە کایەکانی مەعریفـــەدا، شـــتێکی زانراوە کە زانایـــان بەر لە دەســـتکردن بە کارە زانســـتییەکەیان، کۆمەڵێک چەمـــکو گریمانەو بەڵگەنەویســـت بەکار دەهێنن، بە پشکنینیشـــی هەڵناستن، بەڵکو بۆ فەیلەسوفی بەجێدەهێڵـــن، لێـــرەدا ئەمـــەی دواییـــان "واتە فەلســـەفە "بە پرۆسەی پشـــکنینو ڕەخنەی ئەو چەمکو گریمانەو بەڵگەنەویســـتانە هەڵدەستێت " کە ئەم تاقیکردنەوەیەی لەسەر وەستاوە، وریاییو ئاگایانیـــش ئاراســـتەی ئەو لایەنانـــە دەکات، کە تێیاندایە لە بەهێزیو لاوازی. (١٠)

## ٢ – ئەركــى ڕوونــكارى– شــيتاڵكارييانەى فەلسەفە:

فەلســـەفە بۆ شـــيكردنەوەى ئەو پەيوەندييانە تێدەكۆشێت كە لەنێوان زانستە جياوازەكاندا دێتە ئاراوەو لە پاشانيشـــدا شييان دەكاتەوە، ئاشكرايە كە زاناى هەر بوارێك لە بوارەكانى زانســـت گرنگى پێدانەكەى ئاراستەى مەيدانى پسپۆڕييەكەى خۆى دەكات، بەبـــێ ئاوڕدانەوە بۆ ئـــەو پەيوەندييانەى پسپۆڕێتييەكەى بە مەيدانەكانى ترەوە گرێ دەدات، ڕەنگـــە ئەمەش بۆ زۆرى لقى مەعريفە مرۆييەكانو ئالۆزييان بگەڕێتەوە، لێرەدا ئەم ئەركە بۆ فەيلەسوف بەجێ دەهێڵرێ بۆ ئەوەى پێى هەڵبسێت، بەوەش فەيلەسوف بۆ شيكردنەوەى پەيوەندييەكان نێوان لقـــە جياوازەكانى پســـپۆڕێتى تێدەكۆشـــێتو لە پاشاندا بە ڕوونكردنەوەى پەيوەندييان بە ئەزموونى مرۆڤايەتييەوە هەڵدەستێت.

## ٣- ئەركى ڕامانكارانەى فەلسەفە

"ڕامان" ئەركێكى تەواوكەرى ئەوئەركانەيە كە فەلسەفە پێيان هەڵدەستێت، ئەم ڕامانەش فەلسەفە بە ئەزموونـــى مرۆڤايەتيەوە گرێدەداتو دەيگۆڕێتە ســـەرهێزێك كە چالاكى لە ئەزموونى مرۆڤايەتيدا دەخاتە گەڕ، بەشـــێوەيەك كـــە ئەزموونێك دێنە

ئاراوە، کــە بۆ نموونەی بــاڵا بەرزدەبێتەوە، ئەم نموونانەش بە ڕۆڵی خۆیان لە نوێوە بەشــداری لە بنیادنانەوەی ئەزموونی مرۆڤایەتی دەکەن.

بەمجــۆرە ڕامــان دەچێتــە نــاو ئەزموونــی مرۆڤایەتییەوە بۆ ئەوەی بەشداری بکات لە دانانی بینایەکی نوێ بۆی، ئینجا هەوڵی هێنانەدی دەداتو بەوەش ڕۆڵێکــی گەورە دەبینێت لــە پێکهێنانی ئەزموون لە نوێوو لە باشترین شێوەدا بۆی.(١١)

جۆرەکانی فەلسەفە کامانەن؟ مێژووی فەلسەفە بە چەند جۆرێکی زۆر ئاشــنا بــووە، هاتنە ئارای ئەم جۆرانەش یان پشــت بەو بابەتە دەبەســتن، کە فەلسەفە لێی دەکۆڵێتەوە یاخود بەو میتۆدەی بەکاری دەهێنێت، یان لەسەر ئەو پلەو جۆرێتییەی یەقیــن کە فەلســەفە مەبەســتییەتی پێی بگات، ئێمە لێرەدا چەند جۆرێک لەوانە باســدەکەین، کە دەســەڵاتی خۆیانیان بەســەر مێژووی فەلسەفەدا سەپاندووەو، بریتین لە:

١- فەلســەفەی میســالی "ئایدیالیــزم Idealisim"، "لالانــد" لــە فەرهەنگــە فەلسەفییەکەیدا "ئایدیالیزم" بەوە پێناسە دەکات "ئەو ئاراستە فەلسەفییەیە کە هەموو بوون بۆ فیکر دەگێڕێتەوە"و باوەڕی وایە کە شــتە واقیعییەکان جگە لە ئایدیاکانمان شتێکی تر نین.

هیـــچ حەقیقەتێکیش لە جیهانـــدا نییە خودی بیرکردنەوەمان نەبێتو بوونی شـــتەکان پشت بە دەرککردنـــی خود دەبەســـتنو هیـــچ حەقیقەتێک نییە لەودیوی خودەوەو هەڵوێســـتی میسالییانەی فەلسەفە لەم دوو مەسەلەیەدا کورت دەکرێنەوە:

**یەکەم:**

سەربەخۆیی سروشتو پشتبەستنی بەخۆی هیچ نییە وەهم نەبێت، سروشت لە ڕەوتی خۆیدا پشت بە شـــتێکی دیکەی غەیری خۆی دەبەستێ. عەقڵ یاخود گیانی فەردی یان هەمەکی "کلی"ی ئیلاهی ئەو شتەیە کە سروشت پشتی پێ دەبەستێ. (١٢)

**دووەم:**

فەلســـەفەی ڕیالیزم "الواقعیە" Realism، فەلسەفەی واقیعی ددان بە بوونێکی سەربەخۆ بە سروشتو دنیای شـــتەکاندا دەنێت، لە کاریگەری خودو ئاراســـتە شەخســـییەکانی کەم دەکاتەوە، لە بڕیاردان بەسەر شـــتەکاندا نکوولّی لە خودیش دەکات لەو بانگەشەیەیدا، کە گوایە بوونی شتەکان خەڵق دەکات دانیشـــی بە توانـــای (خود)دا ناوە لەسەر ناسینی شتەکان.

ئەم دیدە واقعیە فەلســـەفییە بە دابەشکردنی

بەرپرسیارێتی هەڵدەستێت، بەرپرسیارێتیی زانینی جیهان لەلایەن مرۆڤەوە ڕۆڵی بە خودو کاراییەکەی بەخشیوە، ڕۆڵێکی دیکەش بە سروشتو ئاکتیڤبوونی لە ڕێگەی ئەم کاراییە دووفاقەوە: ئەو کاراییە لەخودەوە هاتووەو ئەوەشیان کە لە سرووشتەوە هاتووە، زانینی مرۆڤ دەربارەی جیهان بەم دووانە بەیەکەوە تەواو دەبێت. (١٣)

**سێیەم:**

فەلسەفەی سروشتی "ناچراڵیزم Naturalism " فەلسەفەی سروشتی بڕوای وایە کە جیهان پێویستی بە هۆکارێک نییە لەسەرووی سرووشتەوە بێت، یاخود بە تەدبیرێکە نەریتی باوەی تێپەڕاندبێ "خارق للعادە".

ئەو بڕوای بەوەیە جیهان بەهۆی خۆیەوە وەستاوە، هەر بۆخۆشی بەڵگەیە لەسەر بوونی خۆیو بۆ خۆی دەبات بەڕێوە، جیهان هیچ ئامانجێکی نییە بیەوێ پێی بگات، ژیانی مرۆییو فیزیکیو ڕەوشتیو گیانی هیچ نین جگە لە ڕووداوگەلێکی سروشتی، بەها ئەخلاقییەکانیش دەکرێ بەهۆکاری سروشتی پاساو بدرێن، بەبێ پێویستبوون بە پەنابردنە بەر هێزێکی باڵاتر لە سرووشتو بەبێ چاوەڕوانکردنی پاداشت یاخود

قەدەری ئەودیو نەریتی بــاوەوە "خارقە العادە"، ئامانجی کردارە ڕەوشتییەکانیش ئەوەیە کە مرۆڤ بە گوێرەی سروشت بژیو ئارەزووەکانی سەرکوت نــەکاتو بۆ سروشــت بگەڕێتــەوەو مەدەنییەتی دەستکرد وازلێبهێنێ، کە لە شوێنەوارەکانی عەقڵدا خۆی دەنوێنێ لە زانستو هونەرو فەلسەفە. (١٤)

**چوارەم:**

فەلســەفەی عەقڵگەرایــی "ڕاشــناڵیزم Rationalism"، فەلسەفەی عەقڵگەرایی بڕوای وایە عەقڵ تاکە ســەرچاوەیە بۆ هەموو جۆرەکانی زانینــی ڕاســتەقینە، ئەم زانینەش بــە زەرورەتو هەموانــدن "التعمیــم" جیا دەکرێتەوە. پێویســتە لــەو ڕووەوە کــە ڕاســتگۆیە، ڕاستگۆییەکەشــی پێویستییەکی عەقڵی دەیکاتە پێویست، لەبەرئەوە بەردەوام هەر ڕاســتگۆیە، مەبەستیش لە هەموانەن "التعمیم" ئەوەیە کە حوکمی ڕاستگۆیانە لە هەموو کاتو شوێنێکدا ڕاستگۆیانە دەبێت، چاوگی ئەوەش سروشتی عەقڵە.

عەقڵگەراکان لەســەر ئەوەش هــاوڕان کە عەقڵ هێزێکی خۆڕسکە لە خەڵکێدا بەگشتی. بڕواشیان وایە کە دروستێتیی بەڵگاندنەکان "الاستدلالات" بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەسەر یاساکانی عەقڵ بەندە، مرۆڤ

له دەرەوە زانستێکی یەقینیانە وەرناگرێت، ئەزموونو تاقیکردنـــەوەش دەستەوەســـانە لەوەی زانســـتی دڵنیاگەرانە "یەقینیانە" بە مرۆڤ ببەخشێ. (١٥)

**پێنجەم:**

فەلسەفەی ئەزموونگەرایی "الفلسفه التجريبيه" Empirism، ئەزموونگەرایـــی بڕوابـــوون بـــە ئایدیا خۆڕســـکە بۆ ماوەکانو پرنســـیپە عەقڵییە بەڵگەنەویســـتەکان رەفـــزدەکات، ئەو پرنســـیپە ڕەوشـــتییە ســـەرەتاییانەش ڕەفـــز دەکات کـــە لەواقیعـــەوە نەهاتـــوونو مەعریفـــە بـــە هەمـــوو شـــێوەکانییەوە بۆ ئەزموون دەگێڕێتەوە، تێبینی دەکرێ کە هەندێک لە ئەزموونگەراکان زێدەڕۆییان کردووە لە مەیلە ئەزموونگەراییەکەیانداو نکوڵییان لـــە بوونـــی عەقڵێک کـــردووە کـــە بیربکاتەوەو زیاد رۆیشـــتوون لە دانانی هەســـتی پەتی "الحس الخالـــص"دا بەســـەرچاوە بۆ مەعریفـــە، بۆ ئەوە ڕۆیشتوون عەقڵ وەک لاپەڕەیەکی سپی دێتەبوون، کە خاڵییە لە هەموو نەخشێک یاخود شوێنەوارێک کـــە کەوتبێتە پێش ئەزمـــوونو تاقیکردنەوە، ئەو ئەزموونە شـــوێنەوارەکانی لەســـەر ئەم لاپەڕەیە بەجـــێ دەهێڵێ، هەروەهـــا وای دەبینن کە بڕیارە عەقڵییـــەکان لە هەموو شـــێوەکانیاندا بە گوێرەی کاتو شوێن گۆڕانیان بەسەردا دێت. (١٦)

**شەشەم:**

فەلسەفەی ماددەگەرایی "ماتریالیزم Mateialism "، ماددەگەرایی بڕوای وایە جەوهەری جیهان ماددەیە، ماددەش بەهێزو جۆراوجۆرێتیو جووڵەو ژیانو بیرکردنەوە جیادەکرێتەوە، عەقڵیش شێوەیەکی لە شێوەکانی گەشەکردنی ماددە، ماددەگەرایی بڕوا بە بوونی شتێک ناکات ناوی گیان یاخود عەقڵ بێت دابڕاو لە ماددە، با ژیانیشی بکرێت بەبەردا، هەروەها پێی وایە دیاردە ویژدانییەکان هیچ نین جگە لە چەند ئەرکێکی ئەندامەکانی مرۆڤ، بۆ نموونە بیرکردنەوە ئەرکی مێشکەو چێژکردن ئەرکی زمانەو...تاد.

ماددەگەرایی نکوڵی لە بوونی خوداش دەکاتو باوەڕی وایە تەنها بیرۆکەیەکە لە عەقڵی خەڵکیدا. (١٧)

**حەوتەم:**

فەلسەفەی گیانگەرا ڕۆحگەرایی "الفلسفە الروحیە Spiritualism "، فەلسەفەی گیانگەرا بڕوای بە بوونی گیان یاخود عەقڵ هەیە یاخود بەوەی هاوشێوەی گیان یان عەقڵە بەتەنها. باوەڕیشی وایە کە سروشتی ئەو شتانەی لەودیوی هەستپێکراوەکانەوە ئامادەن گیانییە لە بنەڕەتدا،

ددان بـــه بوونی پەیوەنـــدی لەنێوانـــی دەروونو جەستەدا، بیرکردنەوەو مێشکدا دەنێت، بەڵام ئەم پەیوەندییە وەک پەیوەندییەکی هۆگەرایانە "علیە: سببیە" دەخاتە لاوە.

ئەو پێی وانییە نە جەســتە هۆکاری دەروونو نـــە بیرکردنەوەش بەرهـــەم "معلول"ی مێشــک بێت وەک هۆکارێک لەو ســـونگەیەوە کە مێشــک ماددەیەو ماددەش نە بیردەکاتەوەو نە هەستیشی هەیە "گیان" یاخود "عەقڵ" لای ئەو ســـەرچاوەی دیاردە ماددیو جەســـتەییەکانە، ئێمە ناتوانین بە هەستەکان درک بە شتەکان بکەین، بەڵکو تەنها بە بیرکردنەوەی پەتی دەیانناسینو بەرهەمی ئەوەش هەمووی ئەوەیە کە سروشت گیانییە. (١٨)

پەیوەنـــدی چییـــە لـــە نێـــوان فەلســـەفەو پەروەردەدا؟ یان بە گوزارشـــتێکی دیکە: کامەیە شـــوێنەواری ئاڵوگۆڕی نێوانیان؟ یەکەمین کار کە ئاماژەی بۆ دەکەین ئەوەیە کە فەلسەفەو پەروەردە دوو ڕووی جودای یەک شتن، یەکەمیان فەلسەفەیە لە کاروبارەکانی ژیاندا.

پەســـەندکردنی پێناســـەی پـــەروەردە بەوەی "فەلسەفەیەکی عەمەلییەو لە هەموو دۆخێکدا".

هانمان دەدا بۆ تەسلیمبوونێکی بێگومانانە بەوەی فەلســـەفەو پـــەروەردە دوو ڕووی دراوێکن، ڕەنگە

دیاریکردنی ئامانجی پەروەردە ئەم بەیەکداچوونەی نێوان فەلسەفەو پەروەردەمان بۆ کەشف بکات. "ئامانجی پەروەردە بە شێوەیەکی توند بە ئامانجی ژیانەوە گرێدراوە. فەلسەفەش ئەوە بڕیار دەدات کە بە ئامانجی ژیان دەبینین، پەروەردەش پێشنیاری وەسیلەکانی هێنانەدیی ئەم ئامانجە دەکات".

جەخت لەسەر ئەو ڕایەش دەکاتەوە کە پێی وایە پەروەردە" لایەنە دینامیکییەکەی فەلسەفەیە، وەسیلەی کردەییانەی هێنانەدیی نموونە باڵاکانە: فەلسەفە لایەنە تیۆرییەکەو پەروەردە لایەنە پراکتیکییەکەی هەمان شتە".

ئەمە هەمووی دەمانخاتە سەر ئەوەی بڵێین پەروەردە نمایشکەری "کارێکی ڕێکخراوە کە ئامانجی گواستنەوەی مەعریفەو گەشەدان بە تواناکانو ڕاهێنانو چاککردنی ئەداکردنی مرۆییە لە کۆی کایەکاندا، لە ڕێگەی ژیانی مرۆڤەوە بە گشتی".

فەلسەفەش ئەو تۆرانە دادەڕێژێ کە پەروەردە پراکتیزەکردنیان دەهێنێتە دی". (١٩)

لێرەدا دەوەستینو پرسیار دەکەین: کامەیە شتی هاوبەش لەنێوان پەروەردەو فەلسەفەدا؟ پەروەردەو فەلسەفە لە بابەتەکەدا هاوبەشن، بابەتی پەروەردە مرۆڤە، مرۆڤیش تەوەرەی بنەڕەتیی بابەتەکانی فەلسەفەیە.

کامانـــەن ئـــەو هۆکارانەی هـــەر یەکێک لەم دووانە دەیگرنەبەر؟ لە ڕاستیدا وەسیلەی پەروەردە عەمەلی زانســـتیی پراکتیکییە، بەڵام وەســـیلەی فەلسەفە فیکری ڕامانکارانەیە.

ئەم ڕاســـتییە دەمانخاتە ســـەر ئەوەی بڵێین بابەتی فەلســـەفە گەورەترە لە بابەتی پەروەردە، بەڵام "هۆکارو ئامرازەکان"ی پەروەردە زۆرترن لە هی فەلســـەفە. بەمەش تێبینیی ئەوە دەکەین کە ئـــەم دووانە لە پەیوەندیی کارێکـــی بەردەوامدان، چونکە فەلســـەفە پێویســـتی بـــە پەروەردەیە بۆ جەختکردنە ســـەر ڕۆڵەکەی وەک وەسیلەیەک، کە بەرجەســـتەکردن هەڵبستێت لە شـــێوەی کارێکی پەروەردەییدا، پەروەردەش لە کاری خۆیدا ناتوانێ ڕێ بـــکات بەبـــێ ئامانجگەلێکی دیاریکـــراو، ئەم ئامانجانەش لە واقیعدا داڕشتنیان بە گوێرەی چەند بنەمایەکی فەلســـەفی بەئاکام دەگات، کە پاڵ بە ئاراستەیەکی ڕوونو دیاریکراوەوە دەدات.(٢٠)

ئەوەی لاپەڕەکان مێژوو بپشـــکنێت ئەوە بەدی دەکات کە پەیوەندیی نێوان فەلســـەفەو پەروەردە زۆر کۆنە، لەهەمان کاتیشـــدا تێبینیی ئەوە دەکات کە ئەو شوێنەوارەی لەسەر یەکتری بەجێی دەهێڵن دەگەڕێتەوە بۆ ســـەرەتا مێژووییەکان، شێوەکانی پەیوەندیـــی نێوانیـــان لـــە کاری فەیلەســـوفانی

نموونەی: سۆفستاییەکانو سـوکراتو ئەفلاتونو ئەرستۆو ئیبن سیناو جۆن دێویدا دەرکەوتووە.

سۆفیستەکان بۆ یەکەمجار لە مێژوودا فەلسەفەو پەروەردەیان بەیەکەوە گرێدا، ئاشـکرایە لای ئەو کەسـەی کە لە مێژووی فەلسـەفە بەئاگایە، کە فەلسەفەکەیان وەک گوزارشتێکی بەهێز لە مەیلی تاکگەرایـی هاتە ئاراوە، دەرەنجامی ئەم مەیلە کە گرنگیی وەرگرتن لە خۆڕسکی بۆماوەیی لە پێشتر دادەنێ، بەدواشـیدا جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی فەزیلـەت وەرگیراوە، مەعریفـەش هەر وەرگیراوە سـەرچاوەی ئەمانـەش هەمووی بـۆ توانای تاک لەسەر فێربوون دەگەڕێتەوە.(٢١)

سـوقرات فەیلەسـوف هـاتو وەرچەرخانێکی لە ئەرکی فەلسـەفەدا دروسـتکرد، لەدوای ئەوەی فەلسەفە ڕووی لە کێشەکانی سروشت بوو، سوقرات لە ڕێگەی ڕاگەیاندنە فەلسـەفییەکەیەوە «بۆ خۆت خۆت بناسە» داوای کرد فەلسەفە لێکۆڵینەوەکەی خۆی ئاراستەی ئینسان بکات.(٢٢)

ئەم وەرچەرخانە لە ئاراستەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا بە نوێکردنەوەیەک لە چەمکی فەلسەفەدا دادەنرێت، دەرەنجامەکەشـی لەیەکترنزیکردنەوەی نێوان فەلسـەفەو پەروەردە بوو، بەڵکو دەتوانین بڵێیـن ئەم نوێکردنەوەیە لە چەمکی فەلسـەفەدا

ســـوقراتی هاندا بۆ ئەوەی ڕاشـــکاوانە بڵێت ئەم دووانە «فەلسەفەو پەروەردە» بە تەواوی بەیەکەوە پەیوەستن، ئەگەر هەر یەک شتیش نەبن..

ڕەنگە مایەی ســـودمەندی بێـــت ئاماژە بەوە بکەین، کە ئامانجی فەلســـەفە لە دیدی سوکراتدا داڕشتنی نەفسی مرۆییەو ڕاهێنانیەتی لەسەر هەقو خێرو جوانـــیو هێنانەدی کۆمەڵگەیەکی باش، ئەو وەسیلەیەی فەلسەفەی سوکرات لە هێنانەدیی ئەم ئامانجەدا پشتی پێ بەستووە بریتییە لە پەروەردە. (٢٣)

ئـــەوەی ســـەیری کۆمارەکـــەی ئەفلاتـــون بـــکات تێبینیـــی بوونـــی پەیوەندییەکـــی پتەو و پێکەوەگرێدانێکی بەهێز دەکات لە نێوان فەلسەفەو پەروەردەدا. لێرەدا مایەی سوودمەندییە باس لەوە بکەین کە ڕۆســـۆی پەروەرشیاری ناودار دەربارەی کتێبی کۆمـــار وتوویەتی، ســـەبارەت بەوەی ئەم کتێبـــە بە گوێرەی خەملاندنی ئەو جوانترین کتێبە لە پەروەردەدا نووسرابێت. (٢٤)

ئەوەی لەم کتێبە وردبێتەوە ( کتێبی سەرچاوە/ وەرگێڕ) پەیوەندییەکـــی زۆر جوان بەدی دەکات، کە ئەفلاتون لە نێوان پەروەردەو فەلســـەفەدا پێی هەستاوە، یەکەمین مەسەلەش کە لێرەدا ئاشکرای دەکەین ئەوەیە، داڕشـــتنی ئەفلاتون بۆ پێناسەی

پــــەروەردە ڕادەیەکـــی زۆر کاریگەرە بـــەو دەیدە فەلسەفییەی کە دەڵێت بەهرەی عەقڵیی منداڵ لە قۆناغی منداڵیدا کاری خۆی ناکات، بەڵکو کارەکەی لە قۆناغی هەرزەکاریدا دەســـت پێدەکات، کەواتە پێناســـەیەکی لەسەر بناغەی ئەم دیدە فەلسەفییە دامەزرانـــد، کە جۆرێکە لە «ئەو ڕاهێنانەی تەواو گونجاوە لەگەڵ ژیانی عەقڵداریدا، کاتێک کە دەست بە دەرکەوتن دەکات». (٢٥)

بـــەم شـــێوەیە ئامانجەکانـــی پـــەروەردە لە فەلســـەفەکەییەوە خوازراونو دەکرێ ئەوەش بەم شێوەیە ڕوون بکرێتەوە:

١-فەلسەفە لای ئەفلاتون ئامانجی جەختکردنە لەسەر یەکێتیی دەوڵەت، ئەم ئامانجە فەلسەفییەش لە پەروەردەدا ڕەنگیداوەتەوە، لەبەرئەوە ئامانجی یەکەمی گەشـــەدان بەگیانـــی کۆمەڵ بووە، یاخود هەســـتکردنی ژیانی بـــە کۆمەڵ، ئەمـــەش لەبەر ئەوەیە کە دەوڵەت لە دیدی ئەفلاتوندا لەسەرووی تاکەوەیە. (٢٦)

لەبەرئەوە داوای زەروورەتی ئەوەی کردووە کە هەمـــوو هاووڵاتییەک خۆی تەرخـــان بکاتو خۆی ڕاهێنێت بۆ خزمەتکردنی دەوڵەت.

٢-فەلســـەفەی ئەفلاتـــون گرنگی بە فەزیلەت «چاکە» دەدات، شوێنەوارەکانی ئەم گرنگیپێدانەش

له پەروەردەدا دەردەکەوێت، تێبینیی ئەوەمان کرد کە لـــە ئامانجەکانی روەردە لەلای گەشـــەپێدانی هاووڵاتیبوونی دروستە لە تاکەکاندا، ئەمەش ئەوە لە پەروەردە دەخوازێ کە هەڵگری بەرپرسیارێتیی چاندنـــی ســـیفەتەکانی میانـــڕەویو جوامێـــریو لێهاتوویـــی ســـەربازی بێت لە لاوانـــدا، پەروەردە لەهەمـــان کاتیشـــدا داواکردنـــی مەعریفەی وردی تایبەت بە سروشتی فەرمانڕەوایيو سروشتی هەقی ڕەهـــای لاوان، بەم ڕێگایەش پـــەروەردە دەتوانێ هاووڵاتیی باش ئامادەبکات.(٢٧)

٣-فەلسەفەی ئەفلاتون ئامانجی بەرزکردنەوەی پێگەی عەقڵە بەســـەر مەســـەلە هەســـتییەکاندا «الحســـیە»و بەرزکردنەوەی دەروونیش بەســـەر جەستەدا، ئەوەش لە پەروەردەدا ڕەنگیداوەتەوە، لـــەو ڕووەوە کە ئامانجی پەروەردە خســـتنەگەڕی بەهـــرەی عەقڵە لە ژیانـــی منداڵدا، ئەمەش مانای پتەوکردنی بڕیاری عەقڵە لە ژیانی گەشـــەکردووی منداڵدا. (٢٨)

«ئەرســـتۆ»ش لە کتێبەکەیدا «سیاســـەت» پەیوەندییـــە پتەوەکـــەی نێـــوان فەلســـەفەو پـــەروەردەی ڕوونکردووەتـــەوە، کتێبەکە لە بەندو فەســـڵە پەروەردەییەکانیـــدا پراکتیکـــی دیـــدە فەلســـەفییەکەیەتی، ئەرستۆ لە نووســـینەکانیدا

دەردەکـــەوێ لەژێر کاریگەریی ئەفلاتوندایە، ڕەنگە ئەوەش لـــەوەدا خۆی دەربخات کـــە هەردووکیان وەک ئەرکێک لـــە ئەرکەکانی دەوڵەت بۆ پەروەردە دەڕوانن، لەبەر ئـــەوە دەبینین هەردووکیان تووڕەن لە ئاست نەبوونی سیستمێکی پەروەردەیی گشتیی یەکگرتوو لە ئەسینادا، داوای ئەنجامدانی شۆڕشێکی گشـــتگیریان لـــە ڕێبازەکانی پـــەروەردەی نەوەی ئایندەی ئەسینییەکاندا کردووە. (٢٩)

ئەرســـتۆ وەک لقێک لە سیاسەت بۆ پەروەردە دەڕوانێ‌و بۆ سیاسەتیش وەک هونەری ئاراستەکردنی کۆمەڵگە دەڕوانی، بەشێوەیەک کە مەزنترین خێر بۆ مرۆڤایەتی بەرهەم بهێنێ، تێبینی کراوەکە ئەرستۆ فەلسەفە دابەشـــدەکات بۆ (فەلســـەفەی تیۆری‌و فەلســـەفەی پراکتیکـــی (عەمەلی) سیاســـەتیش کایەیەکـــە لـــە کایەکانی فەلســـەفەی پراکتیکی و کردەکی). (٣٠) ئەرســـتۆ تێبینیی ئـــەوەی کردووە کە سەرکەوتنی سیاســـەتمەداران لە هەوڵەکانیاندا لەسەر بوونی ئەو ماددە چاکە وەستاوە کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، واتە بوونی گەلێکی چاک، بەمەش کار یەکەمی سیاســـەتمەدار بووە بـــە ئامادەکردنی هاووڵاتییان، ئەرکی پـــەروەردەش پێگەیاندنی ئەم جۆرە کۆمەڵەیە لە هاووڵاتییان. (٣١)

پەروەردە بە تیۆرە فەلســـەفییەکانی ئەرســـتۆ

کاریگەر بووە، بـــە ســـوودمەندی دەزانین لێرەدا ئاماژە بە هەندێک لەم شوێنەوارانە بکەین:

١-دیدی فەلســـەفیی ئەرستۆ دەربارەی مرۆڤ شـــوێنەواری لە پـــەروەردەدا بەجێهێشـــتووە، بۆ ئەوە ڕۆیشـــتووە کە مرۆڤ لە دەروونو جەســـتە پێکهاتـــووە، دەروونیش لە ســـێ هێـــز پێکدێت: ڕووەکیو ئاژەڵیو عاقڵمەند، مرۆڤیش بە عەقڵ لە ئاژەڵ جیادەبێتەوە.(٣٢)

ئەم ئیمتیازەی ئەرســـتۆ بە مرۆڤی بەخشـــیوە هانی داوە بۆ جەختکردنە ســـەر گەشەی فەزیڵەتە عەقڵییەکان، ئـــەوەش بەو پێیەی چەند بەهایەکی باڵای ڕەفتاری مرۆیین.

لێرەوەیـــە گرنگیـــدان بـــە لایەنـــی عەقڵی لە پەروەردەدا لەبەر ئەوەی لایەنی گرنگی کەســـێتیی مرۆڤە.

٢-ئەرســـتۆ بڕوای بە پرنســـیپێکی فەلسەفی هەیە، کـــە پێی وایـــە بیرکردنەوە پرۆســـەیەکی چالاکانەیەو لە بن نایەت، لوتکەی ژیانی عەقڵییەو بە ســـەربەخۆیی لە جەســـتە کاری خۆی دەکات، ئەم تێڕوانینـــە یاریدەی نەمرکردنـــی ئەو بیرۆکە فەلســـەفییەی کرد، کە قسە لە دوالیزمی سروشتی مرۆیـــی دەکات، واتە ئـــەوەی کە مرۆڤ لە عەقڵو جەســـتە پێکهاتووە، ئەم تێڕوانینە لە پەروەردەدا

ڕەنگیداوەتەوە، کە وای لێکردووە بەلای گرنگیدان بە لایەنی عەقڵییە پەتییەکاندا بچێت.

٣-فەلسەفەی ئەرستۆ ئامانجی گرنگیدان بە فەزیڵەتو چاکە مرۆییە جیاوازەکانە، فەلسەفەکەی فەزیڵەی بە شێوەیەک دابەشکردووە، کە هاوبەرامبەری هێزەکانی دەروونی مرۆییەو ئەم دابەشکارییە لە پەروەردەدە ڕەنگیداوەتەوەو لەبەر ئەوە دەبینین ئەرستۆ بڕوای وایە کە دەروون و ڕەوانیی ڕووەکییانە هیچ فەزیڵەتێکی لێوە سەرچاوە ناگرێتو لە بەرامبەر ژیانی منداڵیدایە.

لێرەوە درک بە هۆکاری بیروباوەڕی ئەرستۆ دەکەین سەبارەت بەوەی پەروەردە لە ڕێگەی پێکهێنانی نەریتە چالاکەکانەوە دەبێ پێش پەروەردەی عەقڵ بکەوێ، لەبەرئەوەی ئەو پەروەردەیە کە لەگەڵ منداڵاندا گونجاوە، لە ڕێگەی نەریتەکانەوە بەها باڵاکانی ژیان لە عەقڵی ئەو منداڵانەدا لە سەرەتاکانی منداڵییانەوە نەخش دەبێت. (٣٣)

سەبارەت بە دەروونی ئاژەڵییانەش یەکێکی دیکەیە لەو نەفسانەی فەزیڵەی لێوە بەرهەم نایەت مەگەر لەژێر سەرپەرشتیو ڕابەرایەتیی ئەو هێزە قسەکەرو فەزیڵەتانەوە بەڕێوە بچێت کە لێوەی دەردەچیو بریتین لە جوامێریو فریاکەوتنو

فەزیڵەتـــە عەقڵییەکان لە هێزە قســـەکەرەکانەوە سەرچاوە دەگرن.

ئـــەم دیـــدە فەلســـەفییە کاریگەریی لەســـەر پەروەردە هەبووە، بەوەش بووە بە پەروەردەیەک کە عەقڵی مرۆڤی کردووە بە ئامانجو مەبەســـتو گەشە بـــە فەزیڵەتە عەقڵییەکانـــی دەداتو ئەم جۆرەش لەپەروەردە لای ئەرستۆ فەیلەسوفەکان دەگرێتەوە. (٣٤)

مێژووی فەلسەفە شایەتییەکی دیکەمان پێشکەش دەکات، کە پەردە لەسەر پتەویی پەیوەندیی نێوان فەلســـەفەو پەروەردە هەڵدەداتەوە، ئەم گەواهی و شایەتییە مێژووی فەلسەفەی عەرەبی دەیخاتەڕوو، خاوەنی شـــایەتییەکەش ئیبن سینای فەیلەسوفە، ئیبن ســـینا لە هەمان کاتدا فەیلەسوفێکو پیاوێکی پسپۆڕیشـــە لـــە فێرکردنـــدا، ماوەیەک مەشـــقی وانەوتنەوەی کردووە، کە بە کورت دانانرێ. (٣٥)

لە کتێبەکەیدا «القانون/ یاسا» چەند بەشێکی تایبەتکردووە بۆ چارەسەری پەروەردەی منداڵانو پەروەردەی فەیلەســـوفیش، کتێبێکی تایبەتیشی دەربارەی پـــەروەردە داناوە، کە ناونیشـــانەکەی «نامەیـــەک دەربـــارەی سیاســـەت»ەو تێیدا لە بابەتگەلێکـــی پەروەردەیـــی زۆری کۆڵیووەتەوە. (٣٦)

پێویســـته ئاماژه بەوه بکەین کە ئیبن ســـینا نامیلکەیەکیشـــی هەیـــە بەنـــاوی «دەربـــارەی بەشـــەکانی زانســـتە عەقڵییـــەکان» کـــە نامەی پێنجەمـــە لـــە «نۆ نامـــە دەربـــارەی حیکمەتو سروشـــتزانی» (٣٧)و فەلســـەفەی تێیدا دابەش دەکات بۆ تیۆریو پراکتیکی و ئامانجی فەلسەفەی تیۆری دیاریدەکات، بەوەی «تەواوکردنی نەفســـە کە فێرببێ واتە دەستخســـتنی بیروباوەڕی یەقینی بەحاڵـــی هەبـــووەکان «الموجـــودات» ئامانجی فەلســـەفەی عەمەلیش «زانینی ڕاوبۆچوونێکە له عەمەلدایە».

فەلســـەفەی تیۆریش بۆ ســـێ زانست دابەش دەکات، کـــە بریتین لە «زانســـتی سروشـــتی کە نزمترین زانســـتەو زانســـتی ماتماتیک کە زانستی نێوەندەو زانستی ئیلاهی کە زانستی باڵایە».

فەلســـەفەی پراکتیکیـــش «کردەیی» دابەش دەکات بۆ:

١-زانستی ئەخلاق: لە تەدبیری کارەکانی تاک، یاخود لە مامەڵەو گۆڕانی خودی خۆی دەڕوانێ.

٢-ڕاگرتنی ماڵ: لـــە پەیوەندیی نێوان پیاو و ژنەکەیو منداڵـــەکانو خزمەتکارەکانی دەڕوانێت، بەدواشـــیدا لە مەســـەلەی ڕاگرتنـــی ڕزقو ڕۆزیو بژێوی.

٣ -زانســـتی سیاســـی: لـــە پەیوەندییەکانی نێـــوان خەڵکی لە شـــارێکی دیاریکـــراودا لەگەڵ یەکتـــری دەڕوانـــێ، لەگەڵ پەیوەندیی شـــارەکان لەگـــەڵ یەکترداو لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکەشـــدا. لـــە جۆرەکانی سیاســـەتمەداریو ســـەرۆکایەتیو کۆبوونەوە مەدەنییە خاوەن فەزیڵەکانو خراپەکان دەڕوانێ. (٣٨)

بەمـــەش دەتوانیـــن بڵێین نێوان فەلســـەفەو پەروەردە کـــۆی بابەتە پراکتیکی و عەمەلییەکانی فەلســـەفە دەگرێتەوە، بـــە مانایەکی دیکە، فیکرە فەلسەفییەکەی لە پەروەردەدا لە فیکرە ئەخلاقیو کۆمەڵایەتـــیو سیاســـییەکەیدا بڵاوبووەتـــەوە، بەشـــێوەیەکی دیاریکراویـــش لـــە توێژینـــەوە تایبەتەکانی دەربارەی شـــاری فەزیڵەتو شـــاری رەزیڵەت «خراپیو نزمی».

پەیوەندیی نێوان فەلســـەفەو پەروەردە چییە؟ ئەم پرســـە دەخەینـــە پێش چاوی فەیلەســـوفی پەروەردەکار (جۆن دێوی)

وەڵامی (جۆن دێوی) بۆ ئەم پرسیارە لە کتێبە بەردەستەکانیدا هەڵدەهێنجرێت.

بۆ ئەوە چووە کە فەلسەفە دوو جۆرە:

جۆرێکیان کە پەیوەســـتە بـــە ژیانەوە، بوونو سروشتو ئەرکەکەی لەوەوە دەخوازێ، لە پاشاندا

هەوڵی ڕێکخستنی ئەم ژیانەو ئاڕاستەکردنی دەدات، ئەمەش لە پەروەردە بەولاوە شتێکی تر نییە.

جۆرێکـــی دیکە کە لە ژیـــان دابڕاوەو ماناکەی لەدەســـتدەداتو دەبێتە فەلســـەفەیەکی واژەیی و بۆ مەسەلەگەلێکی میتافیزیکی وەردەچەرخێت کە لێیانەوە ناگەین بە هیچ دەرەنجامێک.

ئەو فەلســـەفەیەی (دێوی) هێناویەتییە ئاراوە لـــە جۆری یەکەمیانە کە لەوپەڕی پەیوەندیدایە بە ژیانەوەو ئەوەش بەو پێیەیە کە پەروەردە بۆ خۆی فەلسەفەیە، فەلسەفەش پەروەردەیە، بەم وتەیەشی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە: «هەر کەسێکی ئاقڵ بـــە مومکینی دەزانێ کە فەلســـەفەکاری دەبێ لە دەوری پەروەردە بســـوڕێتەوە بەو پێیەی ئەوپەڕی گرنگیپێدانی ئینسانییە، لەگەڵ ئەویشدا لە سەرووی ئەوەوە گرفتگەلێکی دیکەی گەردوونیو ڕەوشتیو لۆژیکی دێنە ئاراوە». (٣٩)

لـــە کۆتایشـــدا پێویســـتە بڵێیـــن پەیوەندیی نێـــوان فەلســـەفەو پـــەروەردە بووە بـــە مایەی لەدایکبوونـــی کۆرپەیەکی نوێ، کـــە لەیەک کاتدا ســـیماکانی فەلسەفەو پەروەردەشە بەیەکەوە، ئەو لەدایکبووەش «فەلسەفەی پەروەردە»یە.

فەلســـەفەی پـــەروەردە یەکێکە لـــەو ڕەگەزە فەرهەنگییانەی زۆرترین کارێکی لەگەڵ فەلسەفەدا

هەیـــە، ڕەنگە ئەمەش بــۆ ئـــەوە بگەڕێتەوە کە «فەلســــەفەی پەروەردە ئەو چالاکییـــە فیکرییە ڕێکخراوەیە کە فەلسەفە وەک هۆکارو ئامڕازێک بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی پەروەردەیی‌و گونجانکارییەکەی دەگرێتەبـــەر، لەگـــەڵ ڕوونکردنەوەی ئـــەو بەهاو ئامانجانەی هێنانەدییانی مەبەستە». (٤٠)

کە ئەو مەیدانەیە لە گۆشـــە پەروەردەییەکەوە لـــە کێشـــە فەلســـەفییەکان وەک توێژینەوەیەکی فەلسەفیش لە کێشە پەروەردەییەکان دەکۆڵێتەوە. (٤١)

**تێبینی:** ئەم وتارە کە ناونیشـــانەکەی بریتییە لە: (فەلســـەفەو پەروەردە)و بەشێکە لەو کتێبەی لە خوارەوە ناومان هێناوە، تەرخانە بۆ چۆنیەتیی ســـەرهەڵدان و دەرکەوتنـــی پەروەردەناســـی لە مێـــژوودا، بەڵام بەنـــدە تایتڵەکەیـــم گۆڕیوە، بۆ سەرەتاکانی پەروەردەناسی/ وەرگێڕ.

ژێـــدەری ئەم وتارە: بڕوانە کتێبی (دراســـات فی فلســـفە التربیە/ محمد جلـــوب فرحان-١٩٨٩ بغداد .ل ٧- ٢٣

**پەراوێزەکانی ئەم بەشە:**

1 . Burnet .j: (Greek philosophy ; London 1961) P.3.

2. Zeller.E; Outline of the histoery pf greek ohilosophy :(London 1963) P.2 .

٣. وراجـع ذلک عند"توفيق الطويل": اسـس الفلسـفه ص٧ (القاهـره، ١٩٧٩) ص٤٨-٤٩ (٣) توفيق الطويل، المصدر السابق، ل٣٥-٥٤.

٤. محمـد عبـد الرحمـن مرحبا،المسـأله الفلسفيه،(بيروت،١٩٦١) ص٤٥-٤٦.

٥. بوخينسـكيى، تأريخ الفلسـفه المعاصره فـى اوروبا، نقله الى العربيـه محمد عبد.الكريم الوافى(طرابلس ،بلا تأريخ) ص٩٥-٩٦.

٦. محمـد عبـد الرحمـن مرحبـا، المصـدر السابقه، ص٥٨-٥٨.

٧. كتابا، النفس الانسانيه، (الموصل ١٩٨٦) ص٢٩-٣٠ وكذلـک: محمـد سـمير حسـانين، التربيه (اصولو أساسـيات) (مؤسسـه سـعيد للطباعه، بلا تأريخ ) ص٧.

٨. سـيد ابراهيـم الجبار، التوجيه الفلسـفى والاجتماعى للتربيه، (القاهره بلا تأريخ) ص٣٨-٣٩

٩. المصدر السابق، ص٣٩.

١٠. محمـد لبيـب النجيحى، فلسـفه التربيه، ص٢ (القاهره، ١٩٦٧) ص٣٤.

١١. المصدر السابق، ص٣٥-٣٦.

١٢. يحيى هويدى، مقدمه فى الفلسـه العامه، ص٧ (القاهره،١٩٧٩) ،ص٢٢.
١٣. المصدر السابق، ص٢٤٠-٢٤١.
١٤. توفيق الطويل، المصدر السابق، ص٤٧٦.
١٥. المصدر السابق، ص٣٤١-٣٤٢.
١٦. المصدر السابق، ص٣٤٨-٣٤٩.
١٧. المصدر السابق، ص٤٠وما بعد.
١٨. المصدر السابق، ص٢٤٦وما بعد.
١٩. نبيـه محمود حموده، التأصل الفلسـفى فى التربيه (الانجلو المصريه ١٩٨٠) ص١٣-١٨.
٢٠. سـيد ابراهيم الجبار، المصدر السـابق، ص٤٣-٤٤.
٢١. اميره حلمى مطر، الفلسـفه عند اليونان، (القاهره ١٩٧٤) ص١١٨-١١٩.
٢٢. كتابنا، النفس الانسانيه، ص٩٢.
٢٣. عمـر محمـد التومـى الشـيبانى، تطور النظريات والافكار التربويه، ص٢ (بيروت١٩٧٥) ص٣٠-٣١.
٢٤. روسـو، اميل أو التربيـه، ترجمه عادل زعيتر، (القاهره ١٩٥٦).
٢٥. وهيب ابراهيم سـمعان، الثقافه والتربيه فى العصر القديمه (دار المعارف بمصر ١٩٦١) ص٢٢٩-١٣٠.
٢٦. المصدر السابق، ص٢٣١-٢٣٢.
٢٧. المصدر السابق، ص٢٣٨.
٢٨. المصدر السابق، ص٢٣٨.

٢٩. سعد مرسى لحمد، تطور الفكر التربوى، ظ٣ (القاهره ١٩٧٥) ص١٤١-١٤٢.

٣٠. Zeller.E.,Op.Cit.,p.١٨٧.

٣١. وهيب ابراهيم سمعان، المصدر السابق، ص١٤٥.

٣٢. المصدر السابق.

٣٣. فتحيه سليمان، التربيه اليونانيه والرومانيه القاهره، بلا تأريخ، ص٦١-٦٢.

٣٤. وهيب ابراهيم سمعان، المصدر السابق المصدر السابق، ص٢٥١.

٣٥. عبد الرحمن النقيب، فلسفه التربيه عند ابن سينا، (القاهره ١٩٨٤) ص١٥٩.

٣٦. الب لويس سيخو، رساله فى السياسه لابن سينا، مجله المشرق البيروتيه، المجلد التاسع سنه ١٩١١.

٣٧. ابن سينا، تسع رسائل فى الحكمه والطبيعيات، (القاهره ١٩٠٨) ص١٠٤-١١٨.

٣٨. المصدر السابق، ص١٠٥-١٠٧.

٣٩. احمد فؤاد الاصمواني، جون ديوى، (القاهره ،بلا تأريخ) ص٣٥.

٤٠. محمد ابيب النجيحى، مقدمه فى فلسفه التربيه، القاهره ١٩٦٣ ص٣٣.

٤١. صادق سمعان، الفلسفه والتربيه (القاهره ١٩٦٢) ص١٣٦-١٣٧.